باشترین هاوڕێ ١٩

# منارەی ونبوو

وەرگێڕانی

کاروان ڕەشید

# پێشکەش بێت

بەبرای خۆشەویستم: دکتۆر عبدالرحمن، ئەو هیمای برایەتی و سۆز و خۆشەویستیە، یادخەرەوەی ڕۆژانی ڕابردووی ژیانی زانکۆمە، دان بەو ڕاستیەدا دەنێم ئەم کتێبە بەرهەمی هەوڵ و ماندوو بوونی بەڕێزیانە و لە کۆکردنەوەیدا زۆر ماندوو بوو، لەخوای پەروەردگار داواکارم ئەم کتێبە سودبەخش بێت بۆ هەموان، بمانگێڕێت لە بەندە چاکەکانی خۆی، لە ڕۆژی دوایی دا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندا حەشرمان بکات.

بەندەی هەژار: د.عبدالله عزام

صدا- سنوری پاکستان

(ذیلقعدة -١٤٠٧/ ٢٦-یونیو-١٩٨٧)


ناوی کتێب: منارەی ونبوو

نووسینی: دکتۆر عبدالله عزام

وەرگێڕانی: کاروان ڕەشید محی الدین

تایپ: ڕیاز مەحمود کاکە

پیت چنین: بەیان ڕەشید

دیزاینی ناوەوە: وریا عەلی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ٢٠١٣

تیراژ: ١٠٠٠ دانە :چاپ﴿ چاپخانەی شارستان ﴾﴿سلێمانی﴾

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٦١٠)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفروه ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهد لله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمد عبده ورسوله، صلوات الله وسلام عليه وعلى آله وصحبه وسلم، أما بعد.

بیرم دێت لە کتێبی مێژووی شەشی سەرەتایی باسی دەوڵەتی عوسمانیمان دەخوێند، وەك ئیمپراتۆرێتێکی داگیرکەر باسی دەکراو دەیانناساند وەك داگیرکەری وڵاتە عەرەبییەکان!! بۆ؟ چونکە بەعسە ئەفلەقییەکان مێژووەکەیان داڕشتبوو.

خۆ گومانیشی تێدا نییە سەدامی لەناچوو جگە لەوەی بەعسییەکی عیلمانی بوو، جێبەجێکاری پیلانەکانی ماسۆنیەتیش بوو، یەکێك لە کارەکانیان ناشیرینکردنی ئیسلام و مێژووی مسوڵمانان بوو، نموونەیەکی تری ناشیرینکردنی مێژووەکەمان ئەوە بوو زۆربەی سەربازگە و دەزگاکانیان بەناوی کەسایەتی و رووداوە ئیسلامییەکانەوە ناونابوو وەك: معسكر خالد بن وليد و منظمة حطين و ... هتد. تا کابرای بەندکراو و ستەملێکراو کە ئەو ناوانەی خوێندەوە بێزی بێتەوە و رق لەو مێژووە هەڵگرێ کە ئەم ناوانەی دروستکردووە..

بەڵام لە پاش چاوکرانەوەمان و ئاشنابوونمان بە کەسایەتی و رابوونی ئیسلامی ئینجا زانیمان دەوڵەتی عوسمانی کێیە؟؟!!

دەوڵەتی عوسمانی قەڵایەکی پتەوو بەهێز بوو بۆ مسوڵمانان و پاراستنی یەکێتیی خاکی مسوڵمانان، گەرچی لە ساتەکانی کۆتایی تەمەنیدا لاواز بوو بوو، وە زۆربەی ئەمیرەکانی روویان کردبووە دونیا، بەڵام هەر جولەکە و وڵاتانی خۆرئاوا چاویان تێبڕیبوو وەك گورگێك لەمەڕی دوور لە ڕان.

نازناوی (الرجل المريض)یش جولەکە بۆیان دروت کردبوو.

ئیتر هەرچی پیلان بوو خستیانە گەڕ بۆ لەناوبردنی ئەم دەوڵەتە، جولەکەش لەمەدا پشکی شێری هەبوو.

عبدالله عەززامیش ـ رەحمەتی خوای لێ بێ ـ زۆر بە باشی باسی پیلانەکانی جولکە و هاوپەیمانانی کردووە و بە تایبەتیش کەمال ئەتاتورکی گوڕ بە گوڕ کە جێبەجێکاری پیلانەکان بوو، وە دامەزرێنەری عیلمانیەتی و لەڕەگ هەڵکێشەری دەوڵەتی عوسمانیش بوو.

بەندەش بە باشمزانی بۆ زیاتر ئاشنابوون بە کورتەیەك لە مێژووی جولەکە پاشکۆیەك لەسەر جولەکە بۆ کتێبەکە زیاد بکەم.

خوایە ئێمە بەندەی تۆین و دڵسۆزی دینەکەت و مسوڵمانان و مێژووەکەین، ئەم هەوڵەکەمەمان بۆ بەرکەتدار بکە و بیکە مایەی شارەزابوونی زیاتری مسوڵمانانی کورد زوبان بە ناحەزانیان و ئەڵقەلەگوێکانیان، یارمەتیدەریشمان بە بۆ کاری گەورەتر و خزمەتی زیاتر و دروستکردنەوەی قەڵایەکی پتەوتر.

داواکارم لە ئێوەی مسوڵمانیش لە دوعای خێرتان بێبەشمان مەکەن، سا بەڵکو خوای گەورە دوعای کەسێکتان گیرا بکات و بە رەحمی خۆی قەترە ئاوێکی سازگاری ئەم کوردستانەمان بۆ بکات بەشیفای تەواو کۆتایی بە نەخۆشی و ناڕەحەتییەکانی لاشەم بهێنێ.

سەردار عبدالرحمن

پرۆژەی باشترین هاوڕێ

٢١ شعبان ١٤٣٤

٢٠١٣/٦/٢٩

# بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، أللهم لا سهل إلا ما جعلته سهلا وأنت تجعل الحزن إذا شئت سهلا.

# لەناوبردنی خەلافەت

گومانی تێدا نییە کە لەماوەی ڕابردوودا تورکیا مەترسییەکی گەورەی دروست کردبوو بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەشێوەیەك ئەورووپای تەواو شەکەت و ماندو کردبوو، تا ئەو ئەندازەیەی دووجار لەبەردەم دەروازەکانی (ڤیەننا) وەستا و لە دەرگاکانی (لنین غراد) ی دا، کە ئەو کات بە (بطرس بيرغ) بەناوبانگ بوو.

کەواتە ڕوخاندنی تورکیا لەپێشەنگی کار و قاڵی ئەورووپادا بوو بەتایبەت جولەکەکان، کە لە هەموو کەلەبەر و سوچێکی فەرمانگەکانی جیهاندا دەستە شاراوەکانیان دەجوڵاند، بە تایبەت لە ناوەندە سیاسیەکانی ڕۆژئاوادا ئەویش بەهۆی ئەو دەسکەوت و سامانەی کە لە بانکەکانیان کەڵەکە کرابوو، یان خەرجیە تایبەتیەکانیان بە تایبەت لە ناوخانەوادەی "ڕوتشلید" دا.

کەوابوو دەستکەوتەکانی تورکیا نێچیرێك بوو، بەردەوام چاوە جیاوازەکانی ڕۆژ ئاوای لەسەربوو،! سەبارەت بە ئاینی ئیسلامیش ئەوان کینەیەکی مێژوویی دڵی ژەهراوی کردبوون،بەردەوام ئەو ڕق و کینەیان لە

ئیسلام و موسڵمانان زیاتر دەبوو، دوژمنانی ئیسلام بەردەوام چاوەڕێ بوون و لە دوی هەلێکی گونجاو دەگەڕان هەتا زاڵ بن بەسەریدا و لەناوی ببەن! ڕۆژئاوا بە باشی لەو ڕاستەقینەیە گەیشتبوو کە گونجاوترین ڕێگە بۆ لەناو بردن و وێران کردنی ئەو دەوڵەتە ئەوەیە،بە دەستی ڕۆڵە بەناو موسڵمانەکانی خۆی زەربەیەکی پۆڵایین لە دەوڵەتەکە بوەشێنێت؟! ئیدی لێرەوە ڕۆژئاواییەکان مستەفا کەمالیان هێنایە پێشەوە،بەمەبەستی هێنانە دی ئەو ئاواتانەیان، بێ گومان ڕۆژئاواییەکان ڕۆژێك لە ڕۆژان بە خەونیش نەیان دەتوانی ئەو ئامانجانە بهێننە دی کە ئەو بۆی فەراهەم کردن.

بێ گومان کەسایەتیەکی وەك مستەفا کەمال ئەتاتورك خەونێك بوو لە ئەندێشەی ئەوروپاییەکاندا،پاشان خەونەکە لە ڕاستی نزیك بوویەوە و بوو بە واقیع، لەبەر ئەوە ڕۆژئاواییەکان بڕیاریاندا ئەم کەسایەتیە لە ئاستی مرۆڤ بەرز بکەنەوە، مەبەستیان بوو بۆ جێ بەجێ کردنی پیلانەکانیان وەك پەرستراوێك بیخەنە پێش چاوی خەڵك ؟ هەرچی بوێت ئەنجامی بدات، لە بەرامبەردا ڕەخنەلێگرتنی بە تاوانێك دادەنرا، خاوەنەکەی لێخۆشبوونی بۆ نەبوو ..

پاشان ڕۆژئاوا کاری کرد لەسەر پاراستنی دەستکەوتە لەناو بەرەکانی ئەتاتورك بۆ تورکیا، بۆ ئەمەش هەوڵیاندا ئەو ئەزمونە بەم سەرکردە بیۆێنە تاقی بکەنەوە، ئەویش لەڕێگەی ئەنجامدانی چەند هەڵگەڕانەوەیەکی سەربازییەوە بە سەرکردایەتی کەمال ئەتاتورك، لەبەر ئەوە پێویستە لەبەردەم ئەم دیاردە نامۆیە بوەستین و توێژینەوەی لەسەر بکەین، هەتا بەجوانی ئەو ڕاستەقینەیەمان بۆ ڕون ببێتەوەکە چۆن کەمال ئەتاتورك گەیشتە لوتکەی باڵای بەکرێ گیراوی لەپێناو بەرژەوەندی داگیرکەراندا.؟!

# مستەفا کەمال ئەتاتورک[1] ( ١٨٨٠-١٩٣٨ )

## لەدایکبوونی

مستەفا کەمال ئەتاتورک لە ساڵی "١٨٨٠" لە شاری سلانیك کە (شارێکی جولەکەیە) لەدایك بووە،لەو شارەدا سەدو چل هەزار کەس نیشتەجێ بوون، هەشتا هەزار کەسیان لە جولەکەکانی ئیسپان پێك هاتبوون و، بیست هەزار (جولەکەی دۆنمە)[2]شی تیادا دەژیا، ئەمانە لە پارتێکی سیاسی جولەکە پێکهاتبون، هەرچەندە خۆیان وەك کۆمەڵەیەکی ئاینی جولەکە دەناساند، سەرکردەکەیان ناوی (شتبای زیفی) بوو، ئامانجیان بریتی بوو لە بەرەنگاربوونەوەی خەلافەتی ئیسلامی لە تورکیادا[3]، کاریان دەکرد بۆ کۆکردنەوەی هەموو جولەکەکان لەناو خاکی قودسدا، وەك ئامادەکارییەك بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی جولەکە.

# ڕەچەڵەکی[4]مستەفا کەمال ئەتاتورک

ڕەچەڵەکی مستەفا کەمال بەشێوەیەکی فەرمی دەدرێتە پاڵ (عەلی ڕەزا)، هەروەها دایکی ناوی (زوبەیدە) یە، هەروەك گومانێکی زۆر هەیە سەبارەت

---

[1]- زۆر جار لە بری ناوی موستەفا کەمال، کەمال ئەتا تورك، ئەتا تورك و....بەکار هێناوە. وەرگێڕ

[2] جولەکەی دۆنمە بەو جولەکانە دەوترێت کە دەچوونە تورکیا و بەسەر زارەکی و رووکەش مسوڵمان دەبوون. (وەرگێڕ).

[3] بەڵگەنامەیەکی باڵیۆزی بەریتانی، کە لە (٢٩-٥-١٩١٠، دەرچووە، گۆڤاری (المجتمع) لە ژمارە -٢ ٤٢٥-٤٢٩-بلاوی کردوەتەوە لەساڵی ١٩٧٨دا.

[4]-بڕوانە: (الذئب الاغبر لارمسترنج، ص"١٢-١٣")، هەروەها بڕوانە: (الرجل الصنم لضابط ترکی، ص"٤٦-٥٢").

به ڕەچەڵەکی ئەم پیاوە؟چونکە مستەفا کەمال ئەتاتورک، بەهیچ شێوەیەك (عەلی ڕەزا) ی بە باوکی خۆی نەدەزانی، دەشگوترێت باوك ودایکی خەڵکی ئەلبانیان، بۆ ئەم مەبەستە کەمال ئەتاتورك سەردانی فەرمانگەی باری شارستانی "نفوس"ی لە (سلانیك) کردوەو لەسەر تۆمار ناوی باوکی کوژاندوەتەوە.؟!

هەروەها دەگوترێت (زوبێدە) ی دایکی بەکاری زینا (مستەفا کەمال)ی هەڵگرتوە کە لە یانەیەکی شەوانەدا کاری کردووە، لە کەسێکەوە ناوی (ابدو مسن اغا) بوە،لەبەر ئەمەش (موستەفا) بە حەرام لە دایك بووە.

بێ گومان هاوسەرگیری نێوان (عەلی ڕەزا) و (زوبێدە) سەرکەوتوو نەبووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەبونی جیاوازی تەمەنیان کە دەگاتە بیست ساڵ؟ چونکە (زوبەیدە) کەسێکی جوان بوە وسەقام گیر نەبوە،هەمان کات (عەلی ڕەزا)ش کەسێکی ئاینـدار نەبووە و کاریگەر بووە بە فیکری ڕۆژئاوایی. ناوبراو بە نەخۆشی سیل لە ساڵی "١٨٨٦" دا کۆچی دوایی کردووە،لەپاش خۆی کوڕ و کچێکی بەجێهێشتووە، کەمال ئەتاتورك کوڕەکەی بووە[٥].

## کەسایەتی مستەفا کەمال

کەمال ئەتاتورك لەلایەن هاوڕێ نزیکەکانیەوە بە کەسایەتییەکی دورە پەرێزی داخ لە دڵی قێزەون و ئاژاوەچی ناسراوە، وەك هاوڕێکانی دەیگێڕنەوە بەردەوام ئەتاتورك کێشەی هەبووە لەگەڵ مامۆستاکانیداو ئەو

---

[٥]- بڕوانە: (تاريخ الدولة العثمانية-على حسون، ص٢٨٦).

ساتانه دڵی خۆش بووه که دەستدرێژی کردوەته سەر کەسانی دی! ئەو بەردەوام حەزی لەستەم و زۆرداری بوه وەك: عیرفان ئۆرکا[٦] باسی دەکات.

کەمال ئەتاتورك زۆربەی ناکۆکی و دوبەرەکییەکانی لەگەڵ بەرپرسانی کۆمەڵـەی "ئیتیحـاد و تـەرەقی" دا بـوو؟ چـونکه حـەزی نـەدەکرد کـەس بەرپرســبێت بەســەریەوە،که کەســانێکی وەك:ئــەنوەر پاشــاو تەلعــەت پاشاوجاوید و...تێدابوو.

جارێکیـان ئەنـدامانی کۆمەڵـەی "ئیتیحـادو تـەرەقی" خـەریکی گفتوگـۆ بوون سـەبارەت بەبەرزکردنـەوەی پلـەی مستەفا کـەمال، لـەو کاتـەدا ئـەنوەر پاشا دێتـه وەڵام و دەڵێـت: زۆر چـاك بـزانن ئەگـەر پلـەی پاشـای بـدەینێ، دواتـر حـەز دەکـات بکرێتـه سـوڵتان،ئەگەر ئـەو پلەیەیـشی پێـدرا،ئارەزو و حەزەکانی پەرە دەستێنن و داوای خوایەتی دەکات[٧].!؟

# ئەتـاتورك لە ژیانی خوێندن و سەربـازیدا

سەرەتا کەمال ئەتاتورك پەیوەندی کرد بە قوتابخانەی ئاینییەوە، پاشان دایکی لەو قوتابخانەیە دەری هێناو خستیە بەر خوێنـدنی هاوچەرخەوەو، پاش مردنی باوکی،دایکی لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ گێڵگەی براکەی "حسێن ئاغـا"،ئـەو گێڵگەیــه دەکەوتــه نزیــك "ســلانیك"، ئیـدی لـەوێ ئـەتاتورك سەرگەرمی پاکو خاوێن کردنـەوەی تەویلەکان و ئالیك دان بە ئاژەڵـەکان و چاودێری کردنی گێڵگەکە بوو[٨]؟!.

---

[٦]- بڕوانه (الصراع بین الفکره الاسلامیه والفکره الغربیه، ص٥٣).

[٧]- بڕوانه: (الرجل الصنم، ص٩٠).

[٨]-بڕوانه: (ارمسترنج، ص"١٥"،الرجل الصنم ص"٥٣").

پاشـان لـه "سـلانيك" دايكـی خستيەوە بـەر خوێنـدن، لەبـەر ئـەوەی بـەردەوام خـەريكی پێكـدادان بـوو لەگـەڵ قوتابييەكانـداو شـەڕی لەگـەڵ دەكـردن؟! مامۆستاكەی لێيـدەدات و پاشـان لە قوتابخانـە هـەڵهات، ئيـدی لێرەوە بەيەكجاری وازی لە قوتابخانە هێناو نەگەڕايەوە.

دواتـر سـاڵی"١٨٩٣" لـە "سـلانيك" پەيوەنـدی كـرد بـە قوتابخانـەی سـەربازييەوە، دوای چـوار سـاڵ خوێنـدن لـەو قوتابخانەيـەدا، قۆنـاغی سـەرەتايی تـەواو كرد،پاشـان بـۆ تـەواو كردنـی قۆناغـەكانی خوێنـدنی ناوەنـدی، ڕووی كـردە ناوچـەی (موناسـتر) لـە بـەڵقان، لـەو كاتـەدا فيتنـە و ئـاژاوە سـەبارەت بە خەلافـەت پـەرەی سـەند بـوو، لـە ساڵی[9] "١٨٩٩" دا لـە (موناسـتر) يـش خوێنـدنی تـەواو كرد،پاشـان پەيوەنـدی كـرد بـە كۆلێـژی سـەربازی لـە ئەسـتەنبوڵ، لـە سـاڵی "١٩٠٢" شـدا كۆلێـژی سـەربازی ئەستەنبوڵيشی تەواو كرد،دواتر بۆ درێژەدان بەخوێندن پەيوەنـدی كـرد بـە كۆلێژی (أركان الحرب) هەوو ساڵی "١٩٠٥" تـەواوی كرد،پاشی ئـەوە وەك ئەفـسەرێك بـە پلـەی ڕائيـد، پەيوەنـدی كـرد بـە سـوپای پێنجەمـەوە لـە ديمەشق[10]، ئەو كات تەمەنی بيست و پێنج ساڵ بوو، دواتر لە شام و لە ليوای (الفرسان الثلاثين) دامەزرا.

لـە وڵاتـی شام بۆ مـاوەی دووسـاڵ مايـەوەو پاش تـەواو كردنـی مەشـقە سەربازيەكەی لـە ليـوای (الفرسـان الثلاثين) دا، پلـەی (اغـاس) ی وەرگـرت، ئەم پلەيە دەكەوێتە نێوان ڕائيدو موقەددەمـەوە، دواتـر بەهـەوڵ و كۆشـشی هاوڕێكـانی لـەهاوينی سـاڵی"١٩٠٧" دا گوێزرايـەوە بـۆ "سـلانيك" و لـە

---

[9]- بڕوانە: (ارمسترنج، ص١٨).

[10]-بڕوانە: (ارمسترنج، ص٢٤٦).

فەرمانگەی ئەرکانی سوپای سێیەم دەستبەکاربوو[11]، ئیدی لێرەوە کەمال ئەتاتورك پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی" یەوەو کە ڕکابەری بەهێزی تێدابوو، نموونەی ئەنوەر پاشاو تەلعەت پاشا، کە ئەمانە زۆر پێگەیان بەهێزبوو لەناو پارتەکەدا، سەرئەنجام کێشەو دوبەرەکی لەنێوانیاندا سەری هەڵدا، لە ساڵی "١٩٠٨" کۆدەتای عوسمانی بەسەر سوڵتان عبدالحميد دا ئەنجام درا لەپێناو دانانی دەستوورێکی نوێ، کە یەکسانی لەنێوان موسڵمانان و جولەکە و مەسیحیەتدا بکرێت، کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی" لەم کودەتایە سەرکەوتنی بەدەست هێناو بەڵام کەمال ئەتا تورك بەشداری تێدا نەکرد.

هەر لەهەمان ساڵدا واتە ساڵی "١٩٠٨"، بەمەبەستی دور خستنەوەی، ئەتاتورك نێردرا بۆ تەرابلوسی لیبیا، پاشان گەڕایەوەو لەگەڵ مەحموود شەوکەتدا لە ساڵی "١٩٠٩" دا بەشداری کرد لەڕوخاندنی سوڵتان عبدالحميد دا، ئەو کات ئەتاتورك یەکێك بوو لە ئەفسەرەکانی ئەرکان، نەك سەرۆك ئەرکانی سوپا[12].

بەمەبەستی ئامادە بونی لە چەند مانۆڕێکی سەربازیداو، لەساڵی "١٩١٠"نێردرا بۆ فەڕەنسا، پاش گەڕانەوەی لە فەڕەنسا وەك سەرپەرشتیاری قوتابخانەی سەربازی دەست بەکار بوو، ئەوکات ڕق و کینەی بۆ دروست بوو بەرانبەر بە ئیتیحادییەکان، پاشان گوازرایەوە بۆ فیرقەی سی و هەشتی هێزی پیادە لە "سلانيك".

---

١٠- بڕوانە: (ارمسترنج، ص ٣٢، الرجل الصنم).

١٢- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص ٧٠).

پاش ئەوەی ئیتاڵیا هێرشی کردە سەر لیبیا، ئەتاتورك ڕەوانەی لیبیا کرا، دواتر پلەی (بکباش) ی بەدەستهێناو، پاشان جەنگی بەڵقان دەستی پێ کرد، ئەنوەر پاشا نەخشەیەکی دارشت بۆ لەناوبردنی بولغار.

بەڵام ئەتاتورك فەرمانەکەی ئەنوەر پاشای جێبەجێنەکرد،بەم شێوازە پیلانەکەی پاشا شکستی هێنا،بەمەش تورکەکان ڕووبەڕووی کارەسات بونەوە،ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ڕقی ئەتاتورك بەرانبەر ئەنوەر پاشا، ئەتا تورك مەبەستی بوو شانازی سەرکەوتن بەسەر ناوبراودا نەبڕدرێت و بەوەش لە "ئورنە" تێك شکان بەهۆکاری خیانەتی ئەتاتورکەوە.

پاشان ئەتاتورك پلەکەی بۆ قائیمقام بەرز کرایەوە، بەڵام لێرەوە لە شانۆی سیاسەت دور خرایەوە؟ چونکە ئەو زۆر ڕقی لە ئیتیحادیەکان دەبویەوە،ئەتاتورك تەنها پەیوەندی لەگەڵ جەمال پاشادا هەبوو! ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ بەرژەوەندییەکی هاوبەش کە دژایەتی کردنی ئاڵمان ئەم دوو دوژمنەی کۆ کردبویەوە[13]،بەهۆی ئەوەی زۆر ڕەخنەی لە ئیتیحادیەکان دەگرت، دوورخرایەوە بۆسۆفیا.

لەگەڵ بەرپابونی جەنگی جیهانی یەکەمدا، ئەتاتورك داوای لە ئەنوەر پاشا کرد کە سەرکردایەتی یەك لەبەرەکانی جەنگ لە ئەستۆ بگرێت، پاش ئەوەی چەندین جار داواکاریەکەی ئاڕاستەی ئەنوەرکردەوە،دواتر سەرکردایەتی کردنی بەرەی باشوری لە ئەستۆ گرت کە لە شێوەی جەزیرەی "غالیبولی"[14] بوو، ناوبراو ئازایەتییەکی زۆر بێ وێنەی نواندو چەندین سەرکەوتنی بەدەستهێنا، پاش ئەوەی هاوپەیمانەکان لە "غالیبولی" پاشەکشەیان کرد، ئەتا تورك بەچەندین سەرکەوتنەوە

---

[13]– بڕوانە: (ارمسترنج، ص٥٤).

[14]–بڕوانە: (ارمسترنج،ص٥٦،٥٧).

گەڕایەوەو بەو هۆیەوە دوچاری لوتبەرزی و لەخۆ بایی بوون هات؟ ئیدی لێرەوە پەنای بۆ پیلانگێڕان و کۆدەتا کردن برد بەسەر ئیتیحادیەکاندا، پاشان بڕیاری دەستگیر کردن بۆ ئەتاتورك و هەموو ئەوانە دەرچوو کە دەستیان لەپیلانەکەدا هەبوو، دواتر ئەنوەر پاشا جگە لە کەمال ئەتاتورك هەموو ئەو کەسانەی لە سێدارە دا کە دەستیان لە پیلانەکەدا هەبوو، دوای ئەو ڕوداوە ئەتاتورکی دور خستەوە بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سوپای شەشەم لە ناوچەی قەوقاز،دواتر نێردرا بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سوپای دووەم لە دیاربەکر،پاش ئەمەش مستەفا کەمال هیچ پێگەو ڕۆڵێکی نەبوو کە شیاوی ئاماژە پیّ کردن بێت لەبەر پاشەکشەی هێزەکانی ڕوسیا بەهۆی شۆڕشی شیوعیەکانەوە لە ساڵی "١٩١٧" دا.

پاشان لە ساڵی "١٩١٧" دا نێردرا بۆ شام و هەر ئەو کات پلەی لیوا[١٥] یاخود پاشای وەرگرت و ئیدی کرا بە یاریدەدەری سەرکردەی سوپای دوو.

## دەستبەکاربوونی وەك سەرۆکی بەرەی فەلەستین

لە فەلەستیندا ڕێکەوتنێك لەنێوان سەرکردەی ئینگلیزەکان ژەنەڕاڵ لێنبی و مستەفا ئەتاتورك ئەنجام درا[١٦]، لە ڕێکەوتنەکەدا ئەتاتورك بڕیاری کشانەوەیدا، هەتا لێبنی لەو دەروازەوە بەبیّ هیچ کێشەیەك بچێتە ناوەوە و گورزێکی بەهێز بووەشێنێت لە هەر چوار بەشەکەی سوپای تورکیا،ئەمەش پاش ئەوە هات کە لێنبی لە (أبواب السلط) بە نائومێدی

---

[١٥] - بڕوانە: (الرجل الصنم،ص ٨٤).

[١٦] - بڕوانە: (تاريخ الدولة العلية العثمانية-محمد فريد بك-تعليقات احسان حقي).

گەڕایەوە، شیاوی ئاماژەیە لە ماوەی ڕابردودا لەسەر دەستی جەمال پاشای فەرماندەی سوپای چواری دەوڵەتی عوسمانی دوچاری شکست بونەوە[17].

لە ئەنجامی ئەم خیانەتە گەورەیەدا تورکیا بۆ هەتا هەتایە دوچاری تێك شکاندنێکی گەورە بویەوە، هەمان کات بەرهەمی ئەم شکستە بۆ تورکیا زۆر کارەساتبار بوو، لەو شەڕەدا ژمارەی دیلەکانی تورکیا نزیك دەبونەوە لە سەد هەزار دیل،جگە لە هەموو ئەو سەربازانەی کە لەلایەن ئەرمەن و دروزەکانەوە بە فیشەك دەکوژران[18].

# بەڵگەکان سەبارەت بەخیانەتی ئەتاتورك و ڕێکەوتنی لەگەڵ ئینگلیزدا

بێ گومان بەڵگەیەکی زۆر لەبەر دەستدایە سەبارەت بە خیانەت و ناپاکیەکانی ئەتاتورك و ڕێکەوتنی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا، بەئاڕاستەی پاشەکشە کردن بەهێزەکانی تورکیا لە فەلەستین و تێکشکاندنی سوپای ئیسلام، لەو بەڵگانەش وەك:

١- پاشەکشە کردنی مستەفا کەمال ئەتاتورك لە ناوچەیەکی زۆر گرنگ و ستراتیژی کە بریتی بوو لە ڕۆژهەڵاتی نابلس و وەعرە، هەر هەمان ئەو شەوەی کە هێزەکانی ئینگلیز هاتنە شارەکەوە، ئەتاتورك پاشەکشەی بەسوپای تورکیا کرد، ئەمەش لە شەوی "١٩-٩-١٩١٧" دا بوو، هەروەها پرۆسەی پاشەکشە کردن لە نابلسەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەردەن و دیمەشق و

[17]- بڕوانە: (اعمدة الحكمة السبعة للورانس،ص٣٥٥).

[18]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص ١٠٣).

حەلەب و شاخەکانی تۆرۆس کۆتایی هات،بێ گومان کشاندنەوەی سوپای تورکیا لەو ناچانەدا بەشێوەیەکی زۆر کتوپڕو بەبروسکەیەکی نهێنی و خێرا بووە[19].

٢-ئەگەر ناپاکی ئەتاتورك نەبوایە، هەرگیز لێنبی و هێزەکانی لەو کاتەدا لە ئاست ئەو سەرکەوتنەدا نەبوون کە بەدەستیان هێنا.

سەبارەت بەتوانای هێزەکانی ئینگلیز لەو کاتەدا، لۆرانس دەڵێت: ژەنەراڵ لێنبی لە "٥ ی ئاياری ١٩١٧" دا پێی گوتم: ئێمە لە مانەوەدا زۆر لە خۆمان دەکەین و توانایەکی ئەوتۆمان نییە، پێویستە بەهەر جۆرێك بووە بەرگری لەمانەوەمان بکەین[20]!، هەروەها دەڵێت: (چارەنووسمان پەیوەستە بە عفریتەوە)[21].

هەر لەم بارەوە ژەنەراڵی تورکی دانەری کتێبی (الرجل الصنم) دەڵێت: مستەفا کەمال ئەتاتورك و فەرماندەی هێزەکانی ئینگلیز لەسەر پاشەکشە پێکردنی نهێنیانەی هێزەکان ڕێکەوتن!پاشەکشەکەش بەشێوەیەکی زۆر خێرا جێ بەجێ کراو، سەرئەنجام سوپای تورکیای بێ بەش کردلە دوو باڵی سەرەکی پاڵپشتی کردنی،ئەمەش بووە هۆکاری کەوتن و گلانی سوپای تورکیا بەدەستی دوژمنان[22].

هەر لەم بارەوە یەك لە ئەفسەرە هاوچەرخەکانی تورکیا دەڵێت[23]: هاوڕێکانمان لەبەرەی فەلەستین ئەوەیان دەگێڕایەوە کە ئەسپەکانی

---

[19]- بڕوانە: (الرجل الصنم، ص٤٧٤، تاريخ الدولة العثمانية، د:حسون،ص٢٦٥).

[20]- بڕوانە: (اعمدة الحكم السبعة لورانس،ص٣٣٢).

[21]- بڕوانە: (اعمدة الحكم).

[22]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص٩٨).

[23]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص٤٧٤).

ئینگلیز توانییان ئەو بەرەیە بڕن کە لەژێر دەسەڵاتی ئەتاتورك دا بوو،بەو شێوەیە توانییان لە پشتەوە دەست لە چوار بەرەی سوپای تورکیا بوەشێنن، ئیدی ئەنجامەکەی ئەو کارەساتەی لێ کەوتەوە کە مێشك و ژیری مرۆ ڤ لە ئاستیدا توانای خۆڕاگرتنی نییە.

(جەمال پاشا) ی فەرماندەی سەربازی سوپای چوارەمیش، بۆچوونی وەهابوو ئەتاتورك بەرپرسی یەکەمی ئەو شکستەیە کە ڕوو بەڕووی سوپای تورکیا بویەوە[٢٤].

هەروەها دکتۆر عەلی حەسون دەڵێت: لەساڵی "١٣٣٧" ی کۆچیدا، مستەفا کەمال وەك یەکێك لەفەرماندە سەربازیەکانی سوپا دەست بەکاربوو لە فەلەستین، ڕاستەوخۆ کۆتایی بەجەنگ هێنا لەگەڵ ئینگلیزەکاندا!؟ بەشێوەیەکی فەرمی ڕێگای بەدوژمنان دا کە لە قوڵی باکورەوە پێشڕەوی بکەن بەئاڕاستەی ناو فەلەستین،بەبێ ئەوەی هیچ بەرگرییەك ڕوو بدات،هەمان کات هەر لەو قوڵەوە هەموو هێزەکانی سوپاکەی کشاندەوە بەرەو باکوور بەپێی ئەو نەخشەیەی کە پێشوەخت ڕێککەوتبوون لەسەری.

٣-ئەو ڕۆژەی ئەتا تورك وەك فەرماندەی سەربازی فەلەستین دەست بەکار بوو، ئینگلیزەکان پەیوەندییان پێوە کرد، داوایان لێکرد شۆڕشێك بەرپابکات بەسەر دەوڵەتی ئیسلامی و سوڵتان عبدالحمیددا، بەڵێنی ئەوەشیان پێدا کە لەو بارەوە هاوکاری بکەن، پاشان کەمال ئەتا تورك پەیوەندی کرد بەدوو لەو فەرماندە سەربازیانەی دەوڵەتی عوسمانییەوە کە نزیکی خۆی بوون و بە دۆستی دەزانین و جێگەی متمانەی بوون، لەو

---

[٢٤]- بڕوانە: (تاریخ الدولة العثمانیة،د: حسون،ص٢٦٥).

بارەوە داوای هاوکاری لیْ کردن، لەگەلْ بیستنی هەواڵەکەدا بە ئەتاتورکیان ووت: تۆ بیر لە یاخی بوون مەکەرەوە؟چونکە ئەو کارە لەسیْدارەدانی ئیْمەی تیْدایە! ئامۆژگاریت دەکەین بەوەی ئەو کارە بیر خۆت ببەیتەوە[٢٥].

٤- پاش ئەو شکستەی لەسەر دەستی جەمال پاشا ڕووبەڕووی ژەنەراڵ لیْنبی بویەوە، جەمال پاشا یاداشتیْکی نارد بۆ ئەمیر (فیصل بن الحسین) کە ناوبراو فەرماندەی هیْزە عەرەبیەکان بوو، لە یاداشتەکەدا داوای ئەوەی کردبوو، ڕیْکەوتنیْك لەنیْوان عەرەب و تورکەکاندا ئیمزا بکریْت،بیْ گومان ئەگەر ئەم ڕیْکەوتنە جیْ بە جیْ بکرابایە،زۆر ئەستەم بوو لیْنبی بتوانیْت سەرکەوتن بەدەست بهیْنیْت.

لەم بارەوە لۆرانس دەلْیْت: مەلیك فەیسەلْ لەوەلاْمی یاداشتەکەدا، داوای کاتیْکی گونجاوی کرد بۆ بەستنی ئەو پەیمان نامەیە،هەروەك داوای گریْنتی کردبوو سەبارەت بە وەلائی سوپاکەی جەمال پاشا، لەحالْەتی چۆلْکردنی عەممان لەلایەن تورکەکانەوە، بۆ ئەو حکومەتە عەرەبیەی کە لە ئایندەدا دروست دەبیْت، بەکورتی: (فەیسەلْ مەبەستی بوو سوپاکەی جەمال پاشا لە داهاتوودا پشتگیر و پشتیوانی ئەو حکومەتە بکات کە لە ئایندەدا لە ئەنجامی ئەو پەیمان نامەیەوە لەدایك دەبیْت).[٢٦]

لۆرانس دەلْیْت: لەگەلْ گەیشتنی ئەم هەواڵە بەکەمال ئەتا تورك، ناوبراو تەواو هەلْچوو، لەناو دام ودەزگاکانی دەولْەتدا دەستی کرد بە نانەوەی گیْرەشیْویْنی، هەمان کات ئەتاتورك داوای لە فەیسەلْ کرد کە مل نەدات بۆ داواکاریەکانی جەمال پاشا، لەو بارەوە ئەتاتورك چەندین ڕەخنەو توانجی ئاڕاستەی مەلیك فەیسەلْ کرد، لەبەرامبەر پشتکردنی لە داواکاریەکانی

---

[٢٥]- بڕوانە: (الدولة العثمانية العلية"محمد فريد"،تعليق: احسان حقي،ص٧٥).

[٢٦]- وەرگیْر.

جەمال پاشا، ئەتاتورك پشتیوانی خۆی دوپات كردەوە بۆ دروستبوونی دەوڵەتێكی عەرەبی سەربەخۆ لە دیمەشق دا، هەمان كات بەڵێنی ئەوەی پێدا ئەگەر لە پیلانەكەیدا سەركەوتنی بەدەستهێنا،دیمەشق ڕادەستی مەلیك فەیسەڵ بكات بەمەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتێكی عەرەبی سەربەخۆ[٢٧].

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە: ئایا جگە لە ئینگلیزەكان،كێ بووە ئەو وتووێژە نهێنیەی گەیاندوەتە كەمال ئەتاتورك؟! ئەی لەبەر چی ئەتا تورك هەوڵی لەبار بردنی ئەو ئاشتەواییە دەدات،كە سەركەوتنی پەیماننامەكە بە پلەی یەكەم لەبەرژەوەندی توركیادا بووە؟!یاخود ئەمە ئەوە دەكات پێشتر ئینگلیزەكان پەیمانێكیان بە ئەتا تورك داوە،كەلە حاڵەتی سەركەوتنیدا بۆی جێ بە جێ بكەن؟ ئەمە چ واتایەك دەبەخشێت؟ ئایا بۆ سەرخستنی ئەو پیلانە، پێشوەخت ئەتاتورك و ئینگلیزەكان ڕێك نەكەوتبون؟ ئایا ڕێكەوتنەكە بریتی نەبوو لەڕماندنی خەلافەتی عوسمانی؟ئایا لەبەرامبەر ئەمەدا ئینگلیزەكان كۆمەڵە بەڵێنێكی شەیتانییان نەدا بە ئەتا تورك.؟!؟

بێ گومان قسەكانی لێنبی و كەمال ئەتاتورك لەیەك شوێنەوە سەرچاوەیان گرتبوو، هەردوكشیان یەك ئامانج و مەبەستیان هەبوو! بە دڵنیاییەوە ئەمانە وتەی سەركردەیەكی توركی نیە كە جەنگ لە دژی ئینگلیزەكان دەكات، بەڵكو ئەمە وتەی سەركردەیەكی پارێزەی بەرەی بەریتانیەكانە و لە لێواری مەرگ و ڕووخان سوپاكەیان دەگێڕێتەوەو، موسڵمانانیش لە سەركەوتن بێ بەش دەكات، بێ گومان ئەمەش ئەوە بوو كە ڕوویدا.

---

[٢٧]- بڕوانە: (اعمدة الحكمة،لورانس،ص٣٥٥).

٥-پاش ئەوەی ژەنەڕاڵ لێنبی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هاتە ئەستەنبوڵ بە فەرمی داوای لە دەوڵەتی تورکیای شکست خواردوو کرد، ئەتا تورك بکەنە فەرماندەی سەربازی سوپای شەشەم، ئەو کات ئەم سوپایە لە نزیکی شاری موسڵ بوو، ئامانجی لەم داواکاریەش پاراستنی بەرژەوەندی ئینگلیزەکان بوو لەوناوچەیەدا،بەتایبەت کە موسڵ نەوتێکی زۆری تێدابوو، هەمان کات مەبەستیان بوو ئەتا تورك بکەنە نوێنەرو پارێزەری بەرژەوەندیەکانیان لە ناوچەکەدا.[٢٨]

٦-مستەفا کەمال پاش ئەو شکستەی بەدەستی خۆی بەسەر تورکیایدا هێناو،پاش گەڕانەوەشی بۆ تورکیا، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ قەشەی بەناوبانگ قەشە (FRID) دروست کرد،کە بەرپرسی هەواڵگری ئینگلیزەکان بوولە تورکیا.[٢٩]

٧-مستەفا کەمال پەیوەنییەکی بەهێزی هەبوو بە سوڵتان (وحید الدین) کە بە موحەممەدی شەشەمیش ناو دەبرا،ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە لە بەهاری ساڵی "١٩١٨" ئەتاتورکی وەك یاوەری سەربازی خۆی دامەزراند بوو،هەمان کات ئەو وەلی عەهد بوو، هەروەها کەمال ئەتاتورك ئەوەی بۆ موحەممەدی شەشەم باس کردبوو کە زۆر ڕقی لە ئیتیحادیەکان دەبێتەوە، بێ گومان هەردوکیان ئەوەیان باس کرد کە بۆ بەرژەوەندی تورکیا هەوڵ دەدەن،ئیدی لێرەوە دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی لە پێناو بەدی هێنانی ئامانجێکدا یەکیان گرت و، بەزووترین کاتیش ئەتاتورك بووبە سەربازێکی سوڵتان (وحید الدین) و پارێزەی نهێنیەکانی.

---

[٢٨]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١٠٥).

[٢٩]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١٢٢).

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لەماوەی جەنگدا سوڵتان (محمد رشاد) کە بە سوڵتان موحەممەدی پێنجەم ناسرا بوو،کۆچی دوایی کرد، دواتر سوڵتان (وحید الدین) جێگەی گرتەوەو بوو بە خەلیفە! هاوکات ئەمیش پلەی ئەتاتورکی بەرز کردەوەو ناردی بۆ ئەنادۆڵ، پلەی فەرماندەی ڕوو بەڕوو بونەوەی داگیرکەرانی لەناوچەی ئەنادۆڵ پێی سپێردرا،هەروەها ڕێژەیەکی زۆر زێڕی بە دیاری پێ بەخشی کە بیست هەزار لیرەی ئاڵتونی بوو.[30]

شێخ مستەفا سەبری دەڵێت[31]: ئەو وتە باو و ناسراوەم لەسەر زمانی یەکێك لە ئینگلیزەکانەوە بیست کە وتی:سوڵتان دەیویست بە کەمال ئەتا تورك فێڵ لە ئینگلیزەکان بکات،بەڵام ئینگلیزەکان بە ئەتا تورك فێڵیان لە سوڵتان کرد.؟!

لە ئەنادۆڵ کەمال ئەتا تورك و (كاظم قرة بك) لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە ئەتاتورك بەرپرسیاریەتی ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ بگرێتە ئەستۆ،لە بەرامبەردا ئەویش بەرپرسیاریەتی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ وەربگرێت.

بەڵام کاظم دەڵێت: پاش تێپەڕ بونی هەژدە ڕۆژ بەسەر جێ بە جێ کردنی ئەو نەخشەیەدا و بەدیاری کراوی لە "٣ ی شوباتی ١٩٢٠" دا نامەیەکم لە کەمال ئەتاتورکەوە پێ گەیشت، کە لە نامەکەدا وتبوی: هیچ بوارێك بۆ بەرگری کردنی سەربازی نەماوەتەوە کە لە دژی مەرجە خراپەکانی ڕێکەوتن بکرێت،تەنها لە ناوچەی قەفقاسدا نەبێت...بەڵام لە ناوچەکانی تردا لە توانادا نییە هیچ کارێك ئەنجام بدرێت،ئەگەر تورکیا

---

[30] - بڕوانە: (تعليق: د.احسان حقي، على التاريخ الدولة العثمانية).

[31] - بڕوانە: (تعليق:د.احسان حقي، على التاريخ الدولة العثمانية،ص٧٥٠).

هاوكاری بكات لە دەست بەسەرداگرتنی قەفقاسداو لەو بارەوە لەگەڵیدا یەكهەڵویست بوون،بەو شێوازەئەنادوڵ لە ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاواوە،هەروەها لە عێراق و ئێران و دەروازەكانی هیندەوە، هەموو ئەمانە لەبەردەمیاندا كراوەدەبن.[٣٢]

بۆ ئەو مەبەستە خەلیل پاشای مامەی ئەنوەر پاشا هات بۆ ئازەربایجان "قەفقاسیا"و پێی ڕاگەیاندن:توركیا دەخوازێت ئێوە ڕێگە بە سوپای ڕووسی بدەن كە لێرەوە تێپەڕ ببێت، بەمەبەستی گەیاندنی هاوكای بە سوپای توركیا.

لە وەلأمدا ئەوانیش گوتیان: پێشتریش سوپای ڕووسەكان بەو جۆرە قسانە فریویان داین!پاشان هاتنە ولأتمانەوە بەبێ ئەوەی بتوانین هیچ جۆرە بەرگرییەك بكەین! لەگەڵ ئەوەی ئێمە خاوەنی سوپایەكی بەهێزین و توانای بەرگری كردنمان هەبوو، بەلأم ڕێی پێ نەداین بەرگری لەخۆمان بكەین، ئا بەم شێوازە جارێكی تر كەوتینە ژێر دەسەلأتی ڕووسەكان.[٣٣]

بێ گومان ئەمەش پیلانێكی ئینگلیزەكان بوو،مەبەستیان بوو وەهای دەربخەن كەمال ئەتا تورك دوژمنی بەریتانیایە! هەروەك لەكاتێكدا (ڕاولنسۆن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لەگەڵ "كاظم" كۆ دەبێتەوەو هەمان ئەم پیلانەی بۆ دەخاتە ڕوو؟ "كاظم" سەری سوڕما لەو لێكچوونەی لەنێوان ویستی ئەتا تورك كە خۆی وەك دوژمنی ئینگلیزەكان دەردەبڕێت؟ چونكە ئەتاتورك لە ڕوكەشدا وەك دوژمنی ئینگلیزەكان خۆی نیشان دەدا، هەمان كات ئەم پیاوە "كاظم" سەری سوڕما بوو لە ئارەزوی

---

[٣٢]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١١٠).

[٣٣]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص٤٠٩).

ئینگلیزەکـانیش لـەو بارەوە؟چـونکە بەریتانیـەکانیش ئـەتا تورکیـان بـە دوژمنی سەر سەختی خۆیان دادەنا.[٣٤]

(ڕاولنسۆن) لەگەڵ ڕوسیا لەسـەر سـەر بڕینـی گـەلی قەفقاسـی موسـڵمان ڕێکـەوتبون، بـێ گومـان ئـەم پیلانـەش هـەر خـۆی دایڕشـتبوو! پاشـان بـە ئاڕاستەی جێ بەجێ کردنی ئەو کردەوە قێزەونە، کارنامەی پیلانەکەیان بە کـەمال ئـەتا تـورك سـپارد، پیلانەکـەش لـە لایـەن خـەلیل پاشـاوە ئـەنجام درا،بـەو شـێوەیە گـەلی موسـڵمانی قـەفقاس کەوتنـە ژێـر چـنگی دڕندانـەی شـیوعیەکان و گـەورەترین قەسـابخانەیان لـە دژ ئـەنجام درا،تـا ئێـستاش کاریگەری ئەو کـردەوە دڕندانەیان بەسـەرەوە ماوە،ئەوان دەیـان ویـست بە یەکجاری ئیسلام لەناو گەلی قەفقاسدا بکوژێننەوە، دواتـر ئـەو ڕاسـتەقینەیە ئاشکرا بوو، کە (ڕاولنسۆن) و کەمال ئەتا تورك بەنهێنی لە خـاکی ئـەرزڕوم کۆبوونەتەوە، گرنگی بابەتەکە وەهای کردبوو کـە کۆبوونەوەکـەیان تـا بـەرە بەیان درێژە بکێشێت.[٣٥]

٨-لێـدوانی بەرپرسـانی ئینگلیـز سـەبارەت بـە پێویـستی بەسـتنی پەیماننامەی لێك تێگەیشتن لەگەڵ کەمال ئەتا تورکدا.

لـەم بارەوە "لـورد کیرزون"ی وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا دەڵێت: پـاش ئـەوەی ئـەزمیر بـەو شـێوازە لەلایـەن یۆنانـەوە داگـیر کـرا، لەسـەر هـەموو تـاکێکی تـورکی پێویـستە دوای ئـەم ڕوداوە دڵسۆزی خـۆی لەگـەڵ کێشەی نیشتمانەکەیدا دەربڕێت، کـە لـە ئێستادا ئەتاتورك لـەو بـارەوە پێشڕەوەو لەسەر ئەو ڕێبازە بەردەوامە.[٣٦]

---

[٣٤]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١١٣).

[٣٥]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١٤٨).

[٣٦]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١٥٥).

هـەروەها "سـیر هنـری ولـسون" سـەرۆك ئـەركانی سـوپا دەڵێـت: هـیچ ڕێگەیـەك لەبـەردەم دیبلۆماسـیەتی ئینگلیزەكانـدا نیە،جگـە لـەوەی كـە پێویستە پەیماننامەی لێكتێگەیشتن لەگەڵ كەمال ئەتا توركدا ببەستن.

٩- ئـەو شـانۆیانەی كـە بەبۆنـەی سـەركەوتنەكانەوە ئـەنجام دەدران،بـە تایبەت لە ناوچەكانی سەقاریاو ئەزمیر، لـە سـەرجەم بۆنەكانـدا كـەمال ئـەتا تورك وەك داهێنەرو پێشڕەوی ئـەو سـەركەوتنانە وەسـف دەكـراو، وەك پیـا هەڵـدانیش گـۆرانی بەسـەردا دەوتـرا، كـار گەیـشتە ئـەوەی شـاعیرانیش شیعریان بەسەر دا دەگوت و تەنانـەت ئەحمـەد شـەوقیش لـە وەسـفی ئـەتا توركدا دەڵێت:

الله اكبر كم في الفتح من عجب      يا خالد الترك جدد خالد العرب

بەڵێ سات لە دوای سات شانۆ دەسكردەكەی دەستی ئینگلیز كە خۆیان بەشێوەیەكی ژیرانە كاری دەرهێنانیـان بۆ كردبوو بەرەو سەركەوتن و دوا سـاتەكانی كۆتـایی هـەنگاوی دەنـا، بـە ئاڕاسـتەی ڕمانـدنی خەلافـەتی ئیـسلامی، تـا دەهـات بەریتانیـەكان مـەرجی قورسـتریان بەسـەر سـوڵتانی موسڵمانانـدا دەسەپاند، هـەتا لاوازی بكـەن وبەرەو بچوك بونـەوەی زیـاتری بیەن، هەمان كات كارئاسانی زیاتریـان پێشكەشی ئـەتا تورك دەكرد،هـەتا وەك كەسێكی ئازاو بێ هاوتا وێنای بكەن.

مستەفا سـەبری دەڵێـت[٣٧]: داواكاریمـان پـێ گەیـشت لـە لیژنـەی بـاڵای هاوبەشی هاوپەیمانەكانەوە لە پاریس،كە لە گەورە بەرپرسانی هەریەكە لـە ئینگلتەراو فەڕەنساو ئیتاڵیـاو یۆنـان پێكهـاتبون، لیژنەكە لـە ئێوارەی "١٢ ی مایۆی ١٩١٩" دا بڕیاری دابەزینی سوپای یۆنانی بۆ ناوچەكانی ئـەزمیر

---

[٣٧]- بڕوانە: (تعليق د.احسان حقي، على التاريخ الدولة العثمانية، ص٧٤٨).

و مەكدۆنیای دەركرد، هەروەها لیژنەكە هۆشداریدا لەمەڕ هەر جۆرە بەرەنگاربوونەوەیەك و كارێكی لەو شێوەیەو، بە پێچەوانەی شەڕ ڕاگرتن دادەنرێت، ڕاستەوخۆ پاش ڕۆژێك لە دەرچونی بڕیارەكە، سوپای یۆنان دابەزییە ناو خاكی ئەزمیر.

# جەنگی سەقاریا

هاوپەیمانەكان بە بەردەوامی فشارەكانیان لەسەر سوڵتان عبدالحمید زیاتر دەكرد، هەمان كات سەرقاڵی ئەوە بوون كە بوار بۆ ئەتا تورك بڕەخسێنن، هەتا لە جەنگی سەقاریادا بەهەر نرخێ بووە سەركەوتنی بەباڵادا بكەن، هەروەها هاوپەیمانەكان گڵۆپی سەوزیان بۆ هێزەكانی یۆنان داگیرساندو فەرمانیان پێ كردن كە بەرەو قوڵایی خاكی ئەنادۆڵ پێشڕەوی بكەن! سوپای یۆنان لەنیوەی ڕێگەدا بوو فەرمانی لە هاوپەیمانەكانەوە[38] بۆ هات بەوەی كە سوپاكە لەناو شاخەكاندا بوەستێنن،بەشێوەیەك لەناو شاخەكاندا هیچ ڕێگەیەك نەبوو لەپێشیانەوە هەتا ناوچەكان بەیەكەوە ببەستێتەوە، بەو شێوازە نەیان دەتوانی لە ناو شاخەكاندا هێڵێكی بەرگری بەهێز دروست بكەن.

بەشێوەیەكی كتوپڕو چاوەڕوان نەكراو لە كاتژمێر هەشتی بەیانی هێرشی یۆنان وەستێنرا!؟پاشان پرۆسەی كشاندنەوەی سوپای یۆنان دەستی پێ كرد و ئیدی توركەكان دەستیان كرد بەهێرش كردن؟!دواجار لێرەوە سوپای یۆنان شكستی هێناو سەركەوتنێكی فێلاویشیان كرد بە بەری سوپای توركدا، ئامانج لەمەش ئەوەبوو كە كەسێكی وەك ئەتا تورك

---

[38]- بڕوانە: (ارمسترنج،ص١٤٧).

لە جەنگی سەقاریادا بە براوە بناسێنن[39]!پاش ئەوەی لە شانۆکەدا یۆنان ڕۆڵی شکستی بەسەردا درا، ئیدی خەڵکی ئەنکەرە ڕژانە سەر شەقامەکان و خۆشحاڵی خۆیان بۆ ئەو سەرکەوتنە مەزنەی تورکەکان دەردەبڕی و شانازییان بە سەرکردە سەرکەوتوەکەیانەوە دەکرد کە کەمال ئەتا تورکە، لێرەوە نازناوی "غازی"[40] یان لە ئەتا تورك نا، لەو بارەوە بروسکەی پیرۆزبایی لە وڵاتانی ڕووسیا و ئەفغانستان و هیند و ئەمریکا و فەرەنسا و ئیتاڵیاوە ئاراستەی ئەتاتورك دەکران.[41]

پاش ئەوەی ئەتا تورك لە سەقاریاوە بەو سەرکەوتنەوە گەڕایەوە،ئیدی داوا لە ئەنجومەنی نوێنەران کرا نازنازی "غازی" و چوار ملیۆن لیرە وەك پاداشت بدەنە ئەتاتورك، لێرەوە ئەنجومەنی نوێنەران نازناوی "غازی"یان پێ بەخشی،بەبێ ئەوەی هیچ بڕە پارەیەکی بدەنێ.[42]

## جەنگی ئەفیون

سەبارەت بە جەنگی ئەفیون، هەر شانۆگەرییەکی دیکەی هاوپەیمانەکان بوو، ئەویش پاش ئەوە دێت کە فەرماندە هێزەکانی سوپای یۆنان (هاجیانستس) سەربازەکانی بەبێ خواردن و خواردنەوە بەجێ هێشت؟ بەو شێوەیە گیانی بەرگری لەنێو سەربازەکانی یۆناندا نەما،کەمال ئەتا تورکیش لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هێرشی کردە سەریان و،وەك بروسکە لەبەرەی ئاسیادا سەرکەوت بەسەریاندا.؟

---

[39]- بڕوانە: (تاريخ الدولة العثمانية، على حسونص٢٤٣).

[40]- غازی بە واتای موجاهید دێت.

[41]- بڕوانة: (ارمسترنج، ص٦٧).

[42]- بڕوانة: (الرجل الصنم، ص٢٤٢).

# جەنگی ئەزمیر

لەبەرەی ئاسیادا ناوچەکە بەدەست هێزەکانی یۆنانەوە بوو، ئەمە جگە لەوەی ناوچەکەی ژێر دەستیان گەلێك ستراتیژی و گرنگ بوو، لەگەڵ ئەوەشداو بەپێی پیلانێکی نەخشە بۆ کێشراو لێی کشانەوە، بەبێ ئەوەی تەنها گوللەیەکیش بتەقێندرێت، شوێنەکە بۆ ئەتاتورك چۆڵ کرا[٤٣]؟!

شانۆگەریەکان بەدوای یەکدا دەهاتن و هاوپەیمانەکانیش مەبەستیان بوو بە ئامانجەکانیان بگەن و جێ گۆڕگێ بە سەرکەوتنەکان بکەن، هاوپەیمانان بە ئارەزوی خۆیان و چۆنیان بویستایە و فەرمانیان بە سوپای یۆنان دەکرد، بۆ ئەو مەبەستە سەرەتا داوای پێشڕەوی سوپاو دواتر داوای وەستان و پاشان داوای کشانەوەیان لێ کردن؟!، بەو شێوەیە کەمال ئەتا تورك کەوتە پێشڕەوی و لەبەر چاویانداو بەئاشکرا دەستی کرد بە دەرپەڕاندنی یۆنانیەکان، ئەوانیش وا خۆیان نیشان دەدا کەتوانای جووڵەیان نەماوە.

پاشان کەمال ئەتاتورك چووە ناو خاکی ئەزمیرەوە، زۆر بەبێ دەنگی بە ناوچەکاندا تێپەڕ دەبوو، تەنانەت "ارمسترنج" دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئەگەر بەو پیلانەی هاوپەیمانەکان نەبوایە هەرگیز ئەتا تورك نەیدەتوانی بچێتە خاکی ئەزمیرەوە.[٤٤]

هەروەها کەمال ئەتاتورك چووە ناوچەی بسفۆڕو دەردەنیلی، ئەمە ئەو ناوچەیە بوو کە سوپای بەریتانی تێدا کۆکرابویەوەو هێزەکانی ئینگلیزی تیادا بالا دەست بوون! بەو شێوەیە بە ئازادی چییان بویستایە لە

---

[٤٣] - بڕوانە: (تاريخ الدولة العثمانية، ص٢٨٣).

[٤٤] - بڕوانە: (ارمسترنج،ص١٧٥).

دەوروبـەری بنکـە سـەربازیەکانی بـەریتانیا دەیـانکرد، بـەبێ ئـەوەی بەریتانیـەکان یـەك گوللـەش بـە ئاڕاسـتەی سوپاکەی ئەتا تـورك بتـەقێنن، یـاخود بەپێـچەوانەوە تورکـەکانیش یـەك گوللـەیان بەئاڕاسـتەی هێزەکـانی ئینگلیز نەدەتەقاند[45]؟!.

لـەوەش سـەیرتر ئـەوە بوو،زۆربەی ئـەو چەکانەی هێزەکـانی ئـەتا تـورك شەڕیان پێی دەکرد، بەلێشاو لە ڕوسیاوە بەدەستیان دەگەیشت،ئەو هەموو چـەکە بەناوچـەی بـسفۆڕو دەریـای ڕەشـدا[46] تێپـەڕ دەبـون،بێ گومـان ئـەو ناوچانە لەژێر قەڵەم ڕەوی هێزەکانی ئینگلیزدا بوون.؟!

١٠-هاوپەیمانـەکان وەهـا خۆیـان نیشان دەدا،کـە بـەزەییان بـە سـوڵتان عبدالحمید دا دێتەوەو ڕقیان لە ئەتاتورکە؟! هەروەك ئینگلیزەکان لە"١٦ ی مارسـی ١٩٢٠" دا شـاری قوسـتەنتینەیان داگـیر کـرد، داواکـاری هاوپەیمانەکان بۆ دانیشتوانی شارەکە ئەوەبوو، گوێڕایەلی خەلیفە بن لـە بریارەکانی دا کە هۆکارێك بوو بۆ قورسایی باری سەر شانی ،لە بەرامبەردا ناوچـەکانی (أسـکی شـهر) چـۆڵکران، ئەمـەش پـاش گـەمارۆی هێزەکـانی ئـەتاتورك هـات بـۆ ناوچـەکە، بـەبێ ئـەوەی هـیچ بارگرژییـەك لەنێوانیانـدا ڕوویدات، ناوچـەکانی ئـەنادۆڵیش لـەهێزە هاوپەیمانـەکان پـاك کرایـەوەو؟! خەڵکیش بەو سەرکەوتنانە دڵخۆش بوون.

---

[45]- بڕوانە: (الدولة العثمانية، د.حسون،ص٢٨٤، ارمسترنج،ص١٨٢،١٨٣).

[46]- بڕوانە: (د: حسون،ص٢٨١).

لەهەمان کاتدا شەیخی ئیسلام[٤٧] فەتوایەکی دەرکرد،لە فەتواکەیدا کەمال ئەتا تورك و تاقمەکەی بە کافر بوون حوکم دا،ئیدی لێرەوە ڕق و تووڕەیی خەڵك لە سوڵتان و موفتیش پەرەی سەند.

## ڕێکەوتننامەی سیڤەر

لەگەڵ ئەوەی کەمال ئەتا تورك خەریك بوو دەکەوتە پەلە قاژەو لە لەناو چوون نزیك دەبویەوە، دەستبەجێ هاوپەیمانەکان بەڕێکەوتننامەی سیڤەر ئەتا تورکیان لە لێواری مەرگ ڕزگار کرد، بەپێی ڕێکەوتنەکە وڵاتی تورکیا لەنێو ئەوروپییەکاندا دابەش کرا، ئەستەنبوڵیش وەك دەوڵەتێك دانرا بوو، هەروەها بەپێی ڕێکەوتنەکە هەموو ناوچە عەرەبیەکان لە تورکیا داڕنران! هەروەك تورکیای ئەوروپی و ناوچەکانی (الایحیە) بە ئیدارەی یۆنانەوە پەیوەست کران، هەروەها ئەرمینیاش بوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ناوچەکانی کوردستانیش حوکمی زاتییان پێدرا.هەروەها ڕێژەی سوپایان سنوردار کرد، بە ئاڕاستەی ملدانی سوپا بۆ داوای هاوپەیمانەکان کە دەسەڵاتی داراییان پێ بەخشرابوو، لەگەڵ پاراستنی پۆستە کۆنەکانیان هەروەك کەمینە مەسیحییەکان ماق تایبەتیان بەزیادەوە پێ درا، پاشان دەقی ڕێکەوتننامەی سیڤەر بەشێوەیەکی فراوان بڵاو کرایەوە، ئیدی لێرەوە ڕای گشتییان وروژاندو تووڕەیی جەماوەر لە دژی خەلیفەو سەرۆك وەزیران و ئینگلیزەکان تاوی سەند.

---

[٤٧] - شێخی ئیسلام : لەو سەردەمەی حوکمڕانی تورکیادا بە بەرپرسی یەکەمی وڵات وتراوە (وەرگێڕ).

لەبەرامبەردا هەواڵەکان سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی ئەتاتورك سات لە دوای سات زیاتر دەبوون، کەمال ئەتاتورکیش هانی خەڵکی ئەدا بۆ لەناوبردنی دوژمنان ئەوانیش بەچەپڵە ڕێزان وەڵامیاندەدایەوەو، حەماسەتیان تاوی دەسەند بەرانبەر هەر کەسێك بوەستایە لەسەر ڕێگایاندا، بەو شێوازە سنور کشانی یۆنانیان دوچاری وەستان کردەوە، هەموو ئەو شۆڕشانەش کە لایەنگرانی سوڵتان هەڵیان دەگیرساند خامۆش کران، دواتر ئەنکەرەیان ئازاد کرد، لەهەموو ئەو مەترسیانەی دەورەیان دابوو، پاشان هێرشکرایە سەر (مرعش)، هەموو ئەو سەربازگە فەڕەنسیانە لەناوبران لەگەڵ ئەو ئەرمەنانەی کە لەوێدا سەرباز بوون، هەروەك پەلهاویشتنی کوردەکان تێك شکێنرا!هەروەها هێزەکانی سوپای ئیتاڵیا تێك شکێندران، کە بە درێژایی هێڵی ئاسنینی (قونیە) درێژ بوو بونەوە،دواتر هێرشکرایە سەر سەربازگەکانی ئینگلیز لەلای هێڵی ئاسنینی (أسکی شهر)،پاشان بەرەو دەریا ڕاونران!دواتر سەرجەم ئەو ئەفسەرانە بەدیل گیران کە چاودێری هاوپەیمانەکان بوون، بەدیل گرتنی ئەم ئەفسەرانە کارێکی زۆر گرنگ بوو؟ بەمەبەستی گۆڕینەوەیان لەگەڵ ئەو نوێنەرانەدا کە لە ماڵتەدا بەدیل گیرابوون.

کەمال ئەتا تورك لەکاتی وتارەکانیدا تووڕەیی خۆی دەڕشت بەسەر ئینگلیزەکانداو دەیگوت: ئەم داگیرکەرانە دەزانن کە ئێمە لە ئاستی ئەواندایین و بگرە زۆر لەوانیش باشترین، جا دەبینن بە هەنگاوی یەکسانی هەڵسوکەوتمان لەگەڵ دەکەن، وەڕۆژێك لە ڕۆژان نابینن ملکەچی بنوێنین بۆیان،بەردەوام لە دژیان دەوەستین تا کۆتا هەناسەی ژیانمان و شارستانیەکەیان بەسەردا دەروخێنین.

بەو شێوەیە لەڕێی چەند پەیماننامەو ڕێکەوتنێکی نهێنییەوە کە لەگەڵ ئەتا تورك ئەنجامیاندا،هاوپەیمانەکان بڕیاریاندا ئەستەنبوڵ چۆڵ بکەن،بێ گومان سوپای هاوپەیمانەکان لە قوستەنتینیە بۆ چەند هەزار سەربازێك کەم کرابوونەوە، بە مەبەستی کشانەوە، فەرماندەی گشتی شێوەی پلانەکەی خستە ڕوو،لەو بارەوە هەموو پێداویستیەکانی ئامادە کرد هەتا لە کەمترین ماوەداو بەشێوەیەکی خێرا پرۆسەی کشانەوەکە جێ بەجێ بکرێت، سەرئەنجام لە ماوەیەکی کەمدا و هەموو گەنجینەکان و سەرجەم ئەو پێداویستیانەی کە لەناویاندا بوو سوتێندران،هەروەك سەرجەم پەردەکانیان بۆمبڕێژ کردن، بەمەبەستی ڕێگری کردن لەو کەسانەی کە دەیانەوێت بپەڕنەوە.

زیاتر لەوەش هاوپەیمانەکان بڕیاری وەدەرنانی یۆنانیەکانیان دەرکرد، ئەمە لە کاتێکدایەلە بەشە ئەوروپیەکەی تورکیاوە ئەوان هاوپەیمانیان بوون! لێرەوە بەشێوەیەکی یەکجارەکی بڕیاری ڕۆیشتنی یۆنانیەکانیان لە تورکیا دەرکرد،ئەمەش لەپێناو ئەوەدا بوو سەرکردە مەزنەکە (ئەتاتورك) ئەو کارە بکات، کە بە هەموو ڕۆژئاواییەکان ئەنجام نادرێت.

# پیلانێکی وێرانکەر

ئەم بەڵگەنامەیە پەردە لەسەر ئەو پەیوەندیە توندو تۆڵە هەڵدەماڵێت کە لەنێوان ئەتاتورك و ئینگلیزو هاوپەیمانەکاندا هەبووە، لێرەدا بەجوانی نهێنیەکانی کەمال ئەتاتورك و پاشەکشە پێکردنی سوپای هاوپەیمانەکان دەخەینە ڕوو.

جێی ئاماژەیە ئەم بەڵگەنامەیە لەلایەن هاوڕێیەکی گیانی بە گیانی ئەتاتورکەوە ئاشکرا کرا،کە ناوی (مظهر مفیید قنصوه)، هەمان کات ئەم کەسە پارێزەری نهێنیەکانی ئەتا تورك بووە!.

ئەم پیاوە لە یادەوەریەکانیدا دەڵێت: لە بەرە بەیانی "١٩١٩/٧/٧" داو لەخاکی ئەرز ڕومی ئەنادۆڵدا،کەمال ئەتا تورك دەفتەرێکی دا بەدەستمەوە،زۆر پێداگری لەسەر ئەوە کرد،کە نهێنیەکانی ناو دەفتەرەکە بپارێزم و گوتی: نابێت هیچ کەس بەو نهێنیانە بزانێت، جگە لە (شوکة ثریا ایدمیر)،تکای ئەوەی لێ کردم کە نهێنیەکان لەنێوانی ئەم سێ کەسە نەچنە دەرەوەو پێویستە تا کۆتایی ژیان بیانپارێزین؟!.

پاش ئەوەی دڵنیامان کردەوە لە پاراستنی نهێنیەکان،دواتر گوتی: هەر ئێستا دەست پێ بکەو سەرەتا مێژووەکەی بنوسە،منیش نوسیم لە بەرەبەیانی "٧/٨" ی مانگی تەموزی ساڵی "١٩١٩"دا،شوێن: خاکی ئەرز ڕومی ئەنادۆڵ.

دوای ئەوەی ئەتا تورك بۆی دەرکەوت مێژوەکەم تۆمار کرد،پاشان وتی زۆر باشەو دەست بکە بە نوسنی خاڵەکان:

یەکەم/ پاش ئەوەی سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، ڕژێمی فەرمان ڕەوایی کۆماری دەبێت.؟!

دووەم/ بێ گومان لە داهاتوودا چارەسەری گونجاو بەرامبەر سوڵتان و خانەوادەکەی دەگرینە بەر لە کاتێکی گونجاودا.

سێ یەم/ قەدەغە کردنی بالاّ پۆشی (حیجاب)لە ئافرەتان.

چوارەم/ لابردنی فێست (طربوش) و لەسەر نانی شەپقەو کڵاو وەك سەرجەم دەوڵەتانی پێشکەوتوو.

(مظهر مفييد قنصوه) دەڵێت: لێرەدا بەبێ ویستی خۆم پێنوسەکە لەدەستمدا کەوتەخوار، لەو کاتەدا ئاگای لێ بوو، سەیری کردم و پاشان پێی وتم: لەبەر چی نانووسیت؟ وتم داوات لێ دەکەم لێم نەگریت، ئەگەر بڵێم:تۆ بەشێکت لە ئەندێشە و خەیاڵ پێکهاتووە!؟ پاشان ئەتا تورك بەپێکەنینەوە پێی گوتم، با ڕۆژگاری داهاتوو لەم بارەوە داوەریمان بکات!؟ بەڵام ئێستا داوات لێ دەکەم لە نووسین بەردەوام بیت،پاشان منیش دەستم بە نووسین کردەوە.

پێنجەم/ بەکار هێنانی پیتە لاتینیەکان...منیش وتم پاشا ئیدی با بەس بێت بەس.

بەڵێ سەرئەنجام لێرەوە دەست بە جێ بە جێ کردنی ئەو پیلانە وێرانکەرە کرا، پاش ئەوەی هەندێك لەخاڵەکانی نووسی، (مظهر مفييد قنصوه) چاوی خشاند بەسەر نوسینەکەدا،دواتر ئەتا تورك پێی گوت: ژمارەی ئەو بڕگە چەندە کە گەیشتووینەتە سەری ؟ ئایا چاوت خشاند بەسەر دەفتەری تێبینیەکانتدا؟ ئایا دەزانیت کەسە پاڵەوانەکان چی دەکەن؟

ئایا نازانی ئەو باجە قورسانەی کە گەل دەیان بەخشێت چین؟ لەهەمان کاتدادروشم بەرز دەکەنەوە بۆ ئەو کەسانەی دەیانکوژن و چەپڵەیان بۆ لێ دەدەن؟!

بێ گومان چەندینی لەو جۆرە کەسانە جیهانی ئیسلامییان ماندوو کرد، لەلایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دوژمنانی ئیسلامەوە کران بە پاڵەوان و تێکۆشەرو دروست کەری مێژوو وداڕێژەری شارستانی میللەتان؟ ڕۆژگار چەند لەو کەسانەی زاڵ کرد بەسەرماندا لە ڕێگەی کۆدەتای سەربازییەوە، لە نموونەی ئەتا تورك؟ چەندین لەو کەسە نەفامانە کاروباری میللەت لە

ئەستۆ دەگرن و چارەنوسی دەگرنە دەست،بڕیاری خوێن وگیان و سامانی میللەتیان لە ژێر دەستدایە؟ لە ئەنجامدا دوچاری چەندین نەهامەتی بوینەوە، بەهۆی ئەوەی کەسانێك کران بە کاربەدەست و سەرپەرشتیارمان، کە لە توانایاندا نەبوو کاروباری خۆشیان بەڕێوە ببەن؟! لەناویاندا هەیە بەهۆی گەورەکەیەوە بووە بە فەرمانڕەوای یەکەم و فەرمانده و سەرکردەی لێهاتوو و خاوەن هۆش و ژیری بێ وێنە...!

وصدق رسول الله (ﷺ): سألت ربي ثلاثا فأعطاني اثنين ومنعني واحدة: سألت ربي أن لا يهلك أمتي بالسنة فأعطانيها وسألته ألا يهلك أمتي بالغرق فأعطانيها وسألته أن لا يجعل بأسهم بينهم فمنعنيها[٤٨].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: سێ داوام لە پەروەردگارم کرد،دوانیانی پێ خەڵات کردم ویەکێکیانی لێ وەرنەگرتم: داوام لە پەروەردگارم کرد کە ئومەتەکەم بە وشکە ساڵی لەناو نەبات پێی خەڵات کردم، داوام لێ کرد کە ئومەتەکەم بە خنکاندن لەناو نەبات ئەویشی پێ خەڵات کردم، داوام لێکرد لە نێوان خۆیان دا یەکتر لەناونەبەن، ئەمەیانی پێ خەڵات نەکردم.

وروى مسلم عن ثوبان رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): إن الله زوى لي الأرض فرأيت مشارقها ومغاربها وأن أمتي سيبلغ ملكها ما زوى لي منها، وأعطيت الكنزين الأحمر والأبيض وإني سألت ربي لأمتي ألا يهلكها بسنة عامة وألا يسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم فيستبيح بيضتهم، وأن ربي قال: يا محمد! إني إذا قضيت قضاء فإنه لا يرد، وإني أعطيتك لأمتك

---

[٤٨]- ئیمامی موسلیم لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە گێڕاویەتیەوە، بڕوانە: (مختصر صحيح مسلم)، تەحقیقی ئەلبانی، ژمارە (٢٠٠،٢٠١، ح٢/٢٩١)، هەروەها (صحيح الجامع)، بەژمارە: (٣٥٨٧)، ومسند سعد بن ابي وقاص(٣٣).

**الا أهلكهم بسنة عامة، وأن لا أسلط عليهم من سوى أنفسهم يستبيح بيضتهم ولو اجتمع عليهم من بأقطارها أو قال من بين أقطارها حتى يكون بعضهم يهلك بعضا ويسبي بعضهم بعضا ...**[49]

**واتــه: (ثوبــان) (رضي الله عنه) دەفــەرمووێت: پێغەمبــەری خــــوا (ﷺ) فەرموویــەتی: بــێ گومــان خواتــەنگی زەوی بۆهێنامــەوە یــەك، تــا ئــەو ئەندازەیــەی خۆرهــەڵات وخــۆر ئــاواییم بــینی، دەســەڵاتی ئومەتەکەیــشم دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە بۆم هێنراوەتەوە یەك ،هەردوو گەنجینەی سوورو سپیەکەیشم پێخەڵات کراوە (مەبەست گەنجینەی قەیسەر و کیسرایە)، هەروەها من داوام لەپەروەردگارم کرد ئومەتەکەم بەگشتی بە وشکە ساڵی وقات وقڕی لەناو نەبات و، دووژمنی بەدەر لە خۆیان بەسەریاندا زاڵ نەکات، بەڕادەیەك ڕەگ و ڕیشەیان لەبن دەربهێنێت، هەروەها پەروەردگارم فەرموویەتی: ئەی (محمد) کاتێ من بڕیارێکم دەرکرد تازە گەڕانەوەی نابێت، من ئەوەم خەڵات کردوە بە ئومەتەکەت کە بە وشکە ساڵی وقات وقڕی بەگشتی لەناویان نەبەم و، دوژمنی بەدەر لە خۆیان بەسەردا زاڵ نەکەم ،بەڕادەیەك ڕەگ و ڕیشەیان لەبن دەربهێنێت، یاخود هەرچی خەڵکی سەر زەوی هەیە لە هەموولایەکەوە گەلە کۆمەیان لێبکەن، تاوەکو خۆیان لەناو خۆیاندا هەندێکیان هەندێکیان لەناو دەبەن و،هەندێکیان هەندێکیان بەدیل دەگرن وتاڵانیان دەکەن.**

**بێ گومان خوای گەورە ئەم ئوممەتەی لەوە پاراستووە دوژمنانی بەسەردا زاڵ بکات، بەداخەوە بە درێژایی مێژوو ئەم ئوممەتە هەر لەسەر**

---

[49] - مەبەست لە (الكنزين) ئاڵتون و زیوە، مەبەستی لە کیسراو قەیسەرە، یاخود ڕژێمی پاشایەتی لە عێراق و شام دا، رواه مسلم (٥٢٥٢)، وصحيح ابن حبان (٧٣٤٥)، وابن أبي شيبة في مصنفه (٣١٠٥٦).

دەستی ئەو کەسانە دووچاری ئازارو ناڕەحەتی بوەتەوە کە خۆیان بە موسڵمان زانیوە یاخود لەوەچەی موسڵمانان بوون،کەمال ئەتا تورکیش یەکێکە لەو کەسانە دەستێکی باڵای هەبوو لە ڕماندنی خەلافەتی ئیسلامی و چەوساندنەوەی موسڵماناندا.

پاش ئەوەی ئاماژەیەکمان کرد بە بەکرێ گیراوی ئەتاتورك و ئاستی پەیوەندیەکانی بە ئینگلیزەوە،پێویستە ئاماژە بە وەفاداریەکەی بکەین بۆ ئینگلیزەکان، ناوبراو ئەوەندە خۆشی دەویستن تا ئاستی ئەوەی بەندایەتی بۆ دەکردن! کەمال ئەتاتورك تا ئەو ساتەی مرد،هەر بەو شێوازە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا دەکرد، بەڵێ ئەو تا ئەو ساتەی لەسەر جێگەی مردنەکەی بێ دەنگ بوو،هەر بەناوی سەرۆکایەتی کۆمارەوە ئامۆژگاری باڵیۆزی بەریتانیای دەکردو داوای ئەوەی دەکرد کە پاش خۆیشی پەرە بەو ڕژێمەی حوکم کردنە بدرێت، (بیرس لورین) [50].

## لە بەڵگەنامەیەکدا کەمال ئەتاتورك، داوا لە باڵیۆزی بەریتانیا دەکات، بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی تورکیا :

ئەم بەڵگەنامەیە کە لە ڕۆژنامەی ئەهرامەوە وەرمانگرتووە، ئەویش لە ڕۆژنامەی سەندەی تایمز وەری گرتووەولە ڕێکەوتی"١٥ ی فبرایەری ١٩٦٨" دا لەژێر ناونیشانی (کەمال ئەتا تورك داوا لە باڵیۆزی بەریتانیا دەکات، پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری تورکیا وەربگرێت) بلاو کردوەتەوە.

---

[50] - گۆڤاری ئەهرام پاش ئەوەی لە (سەندەی تایمز)، وەری دەگرێت، لە ١٥ی فبرایەری ١٩٦٨دا بلاوی کردوەتەوە.

ڕۆژنامەکە سەرسوڕمانترین لاپەڕەکانی مێژووی کاری دیبلۆماسی بلاو کردەوە،بەناونیشانی (چۆن دەگونجێت پیاوەکەمان حوکم کردنی تورکیا ڕەت بکاتەوە)، ڕۆژنامەکە لە درێژەی ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت: ئەتا تورکی سەرۆکی تورکیا، بەدرێژایی پانزە ساڵ، دەیویست بە دیکتاتۆری گەلانی تورکی بە لوتیان ڕابکێشێتە ناو سەدەی بیستەم! ئەگەرچی پێشیان ناخۆش بێت؟ ئەوەبوو لە بەرکردنی فێست و بالاَ پۆشی ئافرەتانی قەدەغە کردو پیتی لاتینی هێنایە ناو سیستەمی وولات و نوسینی بە پیتە عەرەبیەکان قەدەغە کردو...

١١- لەکاتێکدا ئەتا تورك لەسەر جێگەی مردنەکەی بوو، لەوە دەترسا کە دوای خۆی کەسێك نەبێتە جێگرەوەی،بەمەبەستی درێژەدان بەو کارە چەپەڵانەی کە خۆی داهێنەریان بوەو ئەنجامی داون،لەو ڕوانگەیەوەو لە نۆڤەمبەری "١٩٣٨" داو، ئا لەو ساتانەدا کە لەسەر جێگەی مردنەکەی بوو؟! بانگهێشتی باڵیۆزی بەریتانی (بیرسی لورین) دەکات بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی لە ئەستەنبوڵ! جێگای باسە ئەو گفتوگۆیەی لەو بارەوە لەنێوانیاندا ڕوویدا، بۆ ماوەی سی ساڵ بەنهێنی مایەوە،ئێستاو پاش ئەو ماوە دورو درێژە لەلایەن (بیرزدیکسون) ەوە پەردە لەسەر ڕوداوەکان هەڵدەماڵدرێت، کە لە باس کردنی ژیانی باوکیەوە (بیرسون دیسکون) ئەم نهێنیانە ئاشکرا دەبن،ئەمەش پاش ئەوە دێت کە لەناو بروسکەکانی (دیسکون) بروسکەیەك هەیەو (بیرسی لورین) ناردویەتی بۆ (هالیفاکس) ی وەزیری دەرەوە، لەوانەیە ئەو بروسکەیە سەرسووڕ هێنەرترین بەڵگەنامە بوو بێت، بەدرێژایی مێژووی هاوچەرخی بەریتانیا!؟ لە بەڵگەنامەکەدا (لورین) بە درێژی باسی چاوپێکەوتنەکەی دەکات کە بەنهێنی ئەتا تورکی دیکتاتۆر لەگەڵیدا ئەنجامی داوە، ناوبراو لە بەڵگەنامەکەدا دەڵێت:

پاش ئەوەی گەیشتمە کۆشکی کۆماری دەبینم بەڕێز ئەتا تورک لەسەر جێگەی مردنەکەی پاڵی دابوو بەسەرینەکەیەوە، کۆمەڵە پزیشکێك لەدەورو پشتیدا بوون، من هێشتا نەڕۆشتبومە ژوورەوە داوای مۆڵەتی لە پزیشکەکان کردو پێی وتن: ئەگەر پێویستم پێتان بوو، بە زەنگەکە ئاگادارتان دەکەمەوە،پاشان ئەتا تورکی پایە بەرز زۆر بەهێواشی و هەمان کات بە بایەخەوە دەستی بە قسان کردو گوتی: من ناردومە بەشوێنتدا،کارێکی بەپەلەم لێت دەوێت؟ ئومێدەوارم زوو وەلامەکەم بەشێوەیەکی یەکلا کەرەوە بدەیتەوەو دڵخۆشم بکەیت!؟.

پاشان (لورین) دەڵێت: ئامۆژگاریەکانت و هاوڕێیەتی بەڕێزتان، لەلای من گرنگترین و پڕ بایەخترین شتن،بەردەوامیش شانازییان پێوە دەکەم و بەرزیان دەنرخێنم؟ ئەمە لەلای من شتێکی جێگیرەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، بێ گومان ئەمەش هۆکارەکەیە لە بۆنە جیاوازەکاندا بەردەوام بەسەربەستییەکی تەواوەوە ڕاوێژت پێ کردووم..تەنانەت ئەو کاتانەش کە وەزیر بویت لە ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیادا، هەر بەو شێوازە مامەڵەت لەگەڵدا کردووم.

پاشان ئەتا تورك هاتە وەلام و گوتی: من دەمەوێت وەك سەرۆك کۆمار پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکەم، جێگرەوەیەك بۆ خۆم دیاری بکەم و وەك سەرۆك کۆماریش دەستور مافی ئەوەی پێداوم،پێش مردنم جێگرەوەی خۆم دیاری بکەم؟! نیازم هەیە کە تۆ وەك جێگرەوەی خۆم دیاری بکەم!؟ دەمەوێت ئێستا گوێم لە وەلامت بێت سەبارەت بە پێشنیارەکەم؟ پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر،باڵیوزەکەی بەریتانیا،داوای لێ بوردنی لە ئەتا تورك کردو سوپاسی کرد سەبارەت بەوەی کە جێگەی متمانەیەتی، پاشان پشتی لە جێگاکەی هەڵکرد.

١٢- لەکاتێکدا کەمال ئەتا تورك لەگەڵ ئەنجومەنی نوێنەراندا لە مشت و مڕو ناکۆکیدا بوو،سەبارەت بە ڕاگەیاندنی سیستەمی کۆماری و هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی، ئەندامێکی ئەنجومەنی نوێنەران کە ناوی (الكولونيل خليل) بوو،هێرشی کردە سەر (عیسمەت ئینو نو)ی لایەنگری ئەتا تورك، هەر لەناو ئەنجومەنی نوێنەراندا یەکێك لەلایەنگرانی ئەتا تورك بە فیشەکێك کوشتی!.

پاشان یەکێکی تر لەئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بە ناوی (عەلی شوکری)، هێرشی توندی کردە سەر ئەتاتورك،دواتر (عوسمان ئاغا) ی سەرۆکی پاسەوانەکانی ئەتا تورك دەستی خستە بینی و خنکاندی؟! بەم شێوەیە پیلانەکە ئاشکرا بوو وپێگەی ئەتا تورك ئالۆز بوو،ئەویش (عصمەت ئاغای)ی لەپۆستی سەرۆك وەزیران لابرد و (فتحی أوفیاری) لە جێگای دانا،بەلاّم ڕێژەی ناحەزانی زۆرترو توندتر دەبوون،ئیدی سەرئەنجام ئەتا تورك شپرزە بوو،لەناو کۆشکەکەیدا بە دڵشکاوی و خەمباری مایەوەو دەستی کرد بە شەراب خواردنەوە.[51]

لێرەوە ڕاستەوخۆ بەریتانیا کەوتە جوڵە بۆ ڕزگار کردنی ئەتا تورك، ئەویش داوای ویلایەتی موسڵی دەکرد، بەمەش بوارێکی تری ڕەخساند، بە ئاڕاستەی کۆکردنەوەو جۆشدانەوەی جەماوەر لە دژی داگیرکەری دەرەکی کەهێزەکانی بەریتانیان، هەروەها کوردەکانیش لە ڕۆژهەلاّتەوە دەستیاندایە شۆڕش،بەلاّم ئەوە ئاشکرا نیە ئایا بەریتانیا ئەم پشێوییەی دروست کرد بۆ ڕزگار کردنی ئەتا تورك یاخود نا،بە دڵنیاییەوە گومان لەوەدا نییە کە ئەو پشێویەکانی بۆ بەرژەوەندی خۆی قۆستنەوە.

---

[51] - بڕوانە: (ارمسترنج،ص٢١٤).

لـەناو گەلیـشدا بەتونـدی دەیگـوت: تورکیالـە مەترسـیدایە!دوژمنـی درەکیمان بەریتانیایە،کە پشتیوانی لە خۆپیشاندانی کوردەکان دەکات و بەپارەو چەك هاوکارییان دەکات.[52]

بێ گومان ئەمە سەرکەوتوو ترین ڕێگایە بۆ داگیر کەران، هـەتا بەهۆیـەوە بەکرێگیراوەکانیان لە لێواری مەرگداو لـەژێر شـەپۆلی تـوڕەیی گەلـدا ڕزگـار بکەن،بەهۆی ئەم شانۆیانەوە،ئەتا تورك گەڕێنرایەوەو کرا بە سەرۆك.

لەم بارەوە "ئارمسترنج" دەڵێت [53]: هەمووتورکەکان چەکیان هـەڵگرت و خۆیـان ئامـادەکردو هـەموو ناکۆکیـە سیاسـی و بەرگرییـە ئاینیـەکانیان وەلانـا، جـا لـە هـەموو ناوچـەکانی تورکیـادا بروسکەی پـشت گـیری وخـۆ بەخشینو هاریکاری بۆ (غازی) ئەتاتورك دوپات کرایەوە؟ چونکە تورکیا لـە مەترسیدایە تەنها (غازی)ش دەتوانێت ڕزگاری بکات؟

بـێ گومـان ئـەم شـانۆیە هاوشـێوەی ئـەوەی یۆنـان بوو،پـاش ئـەوەی شۆڕشـەکە خـامۆش کراودادگـای سـەربەخۆیان دروسـت کرد،ئیـدی بـە ئـارەزوی خۆیـان کەوتنـە لـە سـێدارەدان و بەنـد کـردن و هەڵواسـین و ئەشـکەنجە دانـی نەیارانی،لـەو میانـەدا "٤٦" کـەس لـە سـەرۆك هۆزەکـانی دیار بەکر لەسێدارە دران،کە دوایین کەسیان (شێخ سەعیدی پیران) بوو،ئەم شۆڕشـەیان کـردە بیـانوو بـۆ لـەناو بردنـی نـەیاران و بـەوە تۆمـەتباریان دەکردن کە پەیوەندییان هەیە بەهێزەکانی ئینگلیزەوە، پاشـان نوێنـەران لـە دژیـان وروژان و بەمـەش ژمارەیـەکی زۆری ئەنجومـەنی نوێنـەران بـەرەو دەرەوەی وولآت هـەڵهاتن، دواتـر لـە چوارچـێوەی دەسـتوردا بڕیـاری

---

٥٠- بڕوانە: (ارمسترنج،ص٢١٦).

٥١- بڕوانە: (ارمسترنج،ص٢١٦).

دامەزرانـدنی کۆمەڵەیـەك درا،دەسـتەڵاتی تـەواوەتی درا بـە ئـەتا تـورك بەمەبەستی ڕزگار کردنی وولات لە کێشەکان.

پاشان مستەفا کەمال حەسانەی یاسایی لـە سـەرپەرلەمانتاران هـەڵگرت و چاودێرییەکی توندی سەپاند بەسـەر ڕاگەیاندندا،بەو شێوازە هـەر جۆرە ڕەخنەیـەك لـە حکومـەت بـە خیانـەتی گـەورەی نیشتیمانی هـەژمار دەکراو، دادگا سەربەخۆکان ئەو جۆرە کەسانەیان بە لەسێدارەدان سزا دەدا.

١٣- پاش ئەوەی ئەتا تورك هەموو دەسەڵاتە دەستوری و یاساییەکانی وڵاتـی بـۆ خـۆی پـاوان کـرد،وادەی ڕێکەتننامـەی لـۆزان هاتـە پێـشەوەو وتووێـژەکان لـەو بارەوە مـاوەی سـێ مانگیـان خایاند،واتـە:لـە نۆڤەمبـەری "١٩٢٢" هـەتا فبرایـەری "١٩٢٣" وتوێـژەکان درێـژەیان کێـشا،بێ گومـان ڕێکەوتننامـەی لـۆزانیش بـۆ ڕزگـار کردنـی ئـەتا تـورك بـوو لـەو دۆخـە شـپرزەیەی کـە دووچـاری هـاتبوو، کاتێـك زانییـان ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ نارەزاییـەکان دژی ئـەتا تـورك پـەرە دەسـێنن، لـە ڕوانگـەی ئەنجومـەنی نوێنەران و گەلی تورکیاوە مەرجەکانی ڕێکەوتننامەی لۆزان قورستر بـوون، بـەڵام ئـەو مەرجانـەی گـرنگ بـوون و لەسـەر شـانی ئوممـەت زۆر قـورس دەکـەوتن بـە شـاراوەیی هێڵرانەوە،لەوانـەش: (هەڵوەشـاندنەوەی خەلافـەتی ئیـسلامی، تێکـشکاندنی هـەر جـۆرە هـەوڵێك کـە هـەوڵی گەڕاندنـەوەی خەلافەتی ئیسلامی بـدات و لـەو پێنـاوەدا خـەبات بکـات، دژایـەتی کردنـی هەموو دروشمە ئیسلامیەکان لەناو تورکیاداو، هێنانی یاسـا ئەوروپییـەکان وەك جێگرەوەی یاسا ئیسلامیەکان).

پێویـستە ئامـاژە بـەوە بـدەین نوێنـەری ئـەتا تـورك لـە وتووێـژەکانی لۆزاندا،"عیسمەت ئی نو نو" و قەشە (حاییم ناحوم) بوون.

کاتێك لە وتو وێژەکاندا کێشە دەکەوێتە نێوان"کرزون" ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیاو،"عیسمەت ئی نو نو" ی نوێنەری ئەتا تورك،لەو کاتەدا قەشە (حاییم ناحوم) لە سەفەردا دەبێت وپاش ئەوەی بە ڕوداوەکە دەزانێت، دەستبەجێ بروسکەیەك دەکات بۆ "کرزون" و دەڵێت: منیش بەڕێوەم بەرەو ئەوێ، پاشان دەڵێت: (عیسمەت هاوڕێیەکی خۆشەویستمە و گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانمە، تەنانەت لە یەك وشەشدا سەرپێچیم ناکات).

پاش ڕێکەوتننامەی لۆزان،ناوی کەمال ئەتا تورك دەدرەوشایەوە، بەشێوەیەك ئەو وەك تاکە سەرکردەی سەرکەوتوو نیشان دەدرا! دواتر سیستەمی کۆماری ڕاگەیەندرا، ئیدی بەهێواشی ڕێگە بۆ ئەتا تورك خۆش بوو،هەتا ڕێگە لە سوڵتان بگرێت وەك سەرەتایەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکجارەکی خەلافەتی ئیسلامی، بێ گومان هیچ بیانویەکیان بەدەستەوە نەبوو، هەتا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ خەلافەت هەڵبوەشێننەوە، لەو بارەوە پێویست بوو دوبارە پەنا بۆ شانۆیەك ببەنەوە!بۆ ئەمەش بەریتانیا ئامۆژگاری دوو لە بەکرێ گیراوەکانی خۆی کرد هەتا بەو کارە هەڵبستن، ئەو دوو بەکرێ گیراوەش "ئاغا خان"ی سەرۆکی هۆزی ئیسماعیلیە، "ئەمیر عەلی" بوون، بۆ ئەو مەبەستەش ووتارێکی ناڕەزاییان نارد بۆ ئەتا تورك، سەبارەت بەو هەڵسوکەوتە خراپانەی کە بەرامبەر خەلیفە ئەنجامی داون، بەریتانیا هات بۆ ئەو مەبەستە "ئاغا خان"ی ڕاسپارد، وەك ئەوەی لەناو موسڵماناندا جگە لەو کەسی تری شك نەبردبێت (ئاغا خانێك،کە بە پیاوی شەراب و ئافرەتان ناسرا بوو)، لێرەدا بوارێك هاتە پێشەوە بۆئەتا تورك بۆ هەڵگێڕانەوەی مێژووی "ئاغا خان"،سەرەتا بەهێرشکردنە سەر بەریتانیەکان و بەکرێ گیراوە هاوشێوەکانی"ئاغا خان" دەستی پێ کرد، بەمەش کۆمەڵەی نیشتیمانی هاتە ورووژاندن و،هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەیان

لەدژی خەلیفەو زانایانی ئاینی و بەرپرسانی ئۆپۆزسیۆن دەست پێ کرد،پاشان یاسایەکیان دەرکردو بەپێی یاساکە، هەموو ئەوانەی دژە کۆمار و پاڵپشتی خەلیفەن، سزاکەیان مردنە.

هەمان کات هەموو ئەو ڕاگەیاندکارانەی کە وتەکانی "ئاغا خان" یان بلاو کردەوە،حوکم دران! پاشان کەمال ئەتا تورك فەرمانێکی ئاڕاستەی فەرمانڕەوای قوستەنتینیە کردو، لەسەری پێویست کرد کە کۆتایی بەو دیاردەیە بهێنێت، لەکاتی ئەنجامدانی نوێژەکانیدا کۆمەڵێك دەوروپشتی خەلیفە دەگرن، هەمان کات فەرمانی نزم کردنەوەی پلەی خەلیفەی بۆ نزمترین ئاست دەرکرد،ئەمە جگە لەوەی هۆشداری درا بەوانەی لە دەوروپشتی سوڵتاندان کە لێی دور بکەونەوەو وازی لێ بهێنن.[٥٤]

## لە ( ٣ ) ی مارسی ( ١٩٢٤ )دا خەلافەتی ئیسلامی هەڵوەشێنرایەوە:

دواجار مستەفا کەمال بە نوسراوێك بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەتی ڕاگەیاند؟!؟!هەروەها فەرمانی ئەوەیدا کە دادگا ئیسلامیەکان وەلا بخرێن و دادگا هاوچەرخ و دەسکرد و مرۆڤ کردەکان شوێنیان بگرنەوە.

هەروەك ئەم ناپاکە بڕیاری چوڵکردنی هەموو ئەو قوتابخانە ئاینیانەی دەرکرد،کە زانایانی ئیسلامی وانەیان تێدا دەوتەوە، سەرجەم ئەو قوتابخانە ئاینیانەی بە لایەنی حکومی سپارد،هەتا بۆ بواری غەیرە ئیسلامی بەکاریان بهێنن؟ شیاوی ئاماژەیە (جمعیة الوطنیة)ش یاساکانی

---

[٥٤]- بڕوانە:(ارمسترنج،ص٢٧-٢٠٩).

بێ دوو دڵی و مشتومر جێ بەجێ کرد،پاش دوو ڕۆژ کەمال ئەتا تورك بەرپرسانی پێشوی کۆ کردنەوە و ناردنی بۆ دەرەوەی وڵات، ڕۆژێك پێش ئەوەش بڕیاری دەرکردنی خەلیفەی دەرکرد.

بە داخەوە مستەفا کەمال ئەو قەڵا بڵندەی موسڵمانانی لە ڕەگ و ریشەوە دەرهێنا، ئەو قەڵایەی کە بۆ ماوەی پێنج سەدە منارەیەکی پتەوی موسڵمانان بوو!ئەتا تورك ئەو ئاڵایەی موسڵمانانی پارچە پارچە کرد،کە ماوەی چواردە سەدە جێگەی ئومێدو هیوای هەموان بوو،ئەو موسڵمانانی پەرش و بڵاو کردەوە،هاوشێوەی ئەو مەڕانەی کە بە بێ شوان لە شەوێکی تاریکدا پەرش و بڵاو دەبنەوەو،گەلە گورگ فرسەتیان لێ دەهێنن و پەلاماریان دەدەن!؟لەو ساتەوە دوژمنان شمشێریان لە کێلان دەرهێناوەو چۆن بیانەوێت و چ موسڵمانێکیان مەبەست بێت دەیکوژن و سەری دەبڕن.؟!

ئەمە بەشێکی ئەو بەڵگەنامانە بوون کە پەیوەندی ئەتاتورك بە ئینگلیزەوە دەسەلمێنن،بە دڵنیاییەوە وەك بەندەیەکی خوای گەورە ئەوەی توانیم و بەردەستم کەوت لە بەڵگەنامەو لێدوان و یادەوەریەکان سەبارەت بەم پیاوە خستمە ڕوو،بێ گومان زۆر لە نهێنیەکانی ئەم بەکرێ گیراوە تا ئێستا ئاشکرا نەبوون،خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا سەرجەم نا پاکیەکانی تریشی لە دژی ئیسلام و موسڵمانان ئاشکرا دەکات.

## پەیوەندی مستەفا کەمال ئەتا تورك بەجولەکەوە:

بێ گومان کەمال ئەتاتورك پەیوەندییەکی زۆر بەهێزی لەگەڵ جولەکەدا هەبووە،ئەگەر زیاتر لە ئینگلیزەکان پەیوەندی بە جولەکەوە نەبوبێت بێ

گومان کەمتر نەبووە، بە دڵنیاییەوە جولەکە لە تورکیادا زۆر بە ئاشکرا هاوکاری ئەتا تورك بوون لە بۆ ڕماندنی خەلافەتی ئیسلامی!لەبەر ئەم بەرژەوەندیە هاوبەشەیە کە ئەتا تورك بەشێوەیەکی ئاشکرا، پەیوەندی لەگەڵ جولەکەدا گرتووە و پەرەشی بەو دۆستایەتیە داوە، لێرەدا هەوڵ دەدەین ئەگەر بە کورتیش بێت ئاماژەیەك بەو پەیوەندییانە بکەین:

١-وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا،ئەتا تورك لە "سلانیك" لەدایك بووەئەمە هۆکارە هەتا لەو بارەوە چەندین پرسیار دەربارەی ڕەچەڵەکی ئەم پیاوە بوروژێت، بێ گومان "سلانیك" ناوچەیەکی جولەکە نشینە و زیاتر لە سەد هەزار جولەکەی تێدا ژیاوە، ئەمە لەکاتێکدایە ئەو کاتە کۆی دانیشتوانی "سلانیك" لە سەدو چل هەزار کەس پێك هاتبوو.[٥٥]

٢- زۆرێك لە مێژوو نوس و نوسەرەکان ڕەچەڵەکی کەمال ئەتا تورك دەگەڕێننەوە بۆ سەر جولەکە،ئەوان دەڵێن:ئەتا تورك لە ڕەگەز و ڕەچەڵەك و کردەوەکانیدا کەسێکی جولەکە بووە! نمونەی ئەو کەسانەش ئەو بۆچوونەیان هەیە،وەك (سبیر جعیبس)کە نوسەرێکی مەسیحیە،لە کتێبەکەیدا (جمهوریة أسرائیل العالمیة) ئاماژەی بەم ڕاستەقینەیە کردووە، هەروەك (جبران شامیة) نموونەیەکی تری ئەو نووسەر و مێژوونووسانەیە، هەروەها (عبدالله التل) لە کتێبەکەیدا کە ناوی (الافعی الیهودیة فی معاقل الاسلام) و ئەنوەر جوندی لە (العروبة والاسلام)، هەروەها سادق ڕافعی لە کتێبی (وحی القلم) دا دەڵێت: کڵاوی جولەکە لەناو مۆخی ئەتا تورکدا بوو.![٥٦]

---

[٥٥]- بەپێی ڕاپۆرتی باڵیۆزی بەریتانی(لاوزەر) کە ساڵی "١٩١٠" ئامادەی کردووە.

[٥٦]-بڕوانە: (کتێبی "عبدالله التل" "الافعی الیهودیة-بەشی تایبەت بە تورکیا"، هەروەها کتێبی "الاسلام ولاعروبة"ی ئەنوەر جوندی، چاپی ١٩٨٣، هەروەها کتێبی "المخطوطات التلمودیة"ی

٣- له (شیشلی): که ناوچەیەکی تورکیە، ئەفسەرێکی جولەکەی دۆنمە مەشقی پێ کردووە.[٥٧]

٤-لە ساڵی "١٩٢٣" دا، پارتی گەلی کۆماری بۆ دۆنمەو ماسۆنیەکان دامەزراند.[٥٨]

٥- بێ گومان یەك لە ئەندامە باڵاکانی کۆمەڵەی "ئیتیحادو تەرەقی" جولەکە بوو، هەروەك زۆربەی بەرپرسەکانی ئەو پارتە جولەکە بوون، لەم بارەوە (ستون وطسون) یش دەڵێت: کەمال ئەتا تورك کەسێکی ماسۆنی بووە، هەروەك دکتۆر (أرنست رامزر) پێداگری لەسەر ئەم ڕاستیە دەکات.

هەر لەم بارەوە(بینو میشان) دەڵێت: ئەتا تورك بەشێوەیەکی فەرمی پەیوەندی لەگەڵ ماسۆنیەکاندا کرد، هەمان کات دەچوویەوە سەر کۆمەڵی (نیدانا).[٥٩]

هەروەها لە دائیرەی مەعاریفی ماسۆنیدا هاتووە: (کێ ڕۆڵی ئەتا تورك دەبینێت لەناو پیاوانی ماسۆندا).[٦٠]

---

ئەنوەر جوندی، ص ١٢٨-٢٣٤" هەروەها کتێبی "الاتجاهات الوطنیة"ی د.محمد محمد حسین، هەروەها کتێبی"ترکیا الحدیثة" ی محمد عزت دروزه).

[٥٧]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١٢٢).

[٥٨]- بڕوانە: (الافعی الیهودیة لعبدالله التل،ص٩٠).

[٥٩]- بێ گومان ماسۆنیەکان ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە دارشتنی پیلانی دۆزەخی بە ئاراستەی ڕووخاندنی خەلافەتی عوسمانی، لەو بارەوە دائیرەی مەعاریفی ماسۆنی دەڵێت:ئەو هەڵگەڕانەوەیەی کە برای گەورەمان ئەتاتورك پێی هەستا، بوو بە مایەی سودی هەموان و، سەرئەنجام هێزو دەسەڵات و خەلافەتی ئیسلامی لەناوبرد، ئەمەش بوو بە دەسپێکی ڕووداوێکی گرنگ کە بریتیە: لە جیاکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە دەوڵەت و فەرمان ڕەوایی؟ئایا ئەمە گەورەترین چاکسازی نیە کە ماسۆنیەت لەناو هەموو گەلاندا ئەنجامیدا؟ بێگومان مستەفا کەمال نمونەیەکە لە پیاوەکانمان کە لەماوەی ڕابردوودا توانی ئەوەی خرابویە سەر شانی بە ڕێك و پێکی ئەنجامی بدا، کە بریتی بووله ڕووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی و جیا کردنەوی ئاین و دەوڵەت. وەرگێڕ.

شتێکی ڕون و ئاشکرایە ماسۆنیەت، لافیتەیەکە لە لافیتەکانی جولەکە، چەندین شانەی نوستوو لەناویدا بە نهێنی کار بۆ جولەکە دەکەن،ماسۆنیەکان دروشمەکەیان بریتیە لە پەرگالێکی گۆشەیی و لەناویدا ئەستێرەیەکی شەش پالۆی تێدایە،کە مەبەستیان ئەستێرەکەی پێغەمبەر داوودە، بێ گومان ئەوان لەو بەرین و ئەو پێغەمبەرە ئازیزەش لەوان بێ بەرییە، ئەمەش نیشانەیەکە بۆ دوبارە بنیاتنانەوەی پەیکەری مزگەوتی قودسی پیرۆز، جولەکەش خەون بەوەوە دەبینن یەك لە کوڕەکانی داوود لەسەر مزگەوتەکە چوار مشقی لێی دانیشێت و لە عەرشەکەیەوە سەرپەرشتی کاروبارەکانی جیهان بکات.

ماسۆنیەت بەهەموو لقەکانیەوە لە چەندین تۆڕی نهێنی پێك هاتووە،کە هەمویان لەخزمەت بەدی هاتنی ئامانجەکانی جولەکە دان و لە پێناو خەونەکانی جولەکەدا بەردەوام لە خەباتدان،لە گرنگترین لقەکانی ماسۆنیەت،وەك: (نوادی، الليونز، الروتاري، بني البرث، ابناء العهد).

٦- لەماوەی حوکمی کەمال ئەتا تورکدا کاروبارەکانی جولەکە بەشێوەیەکی زۆر باش بەرەو پێشەوە دەچون،هەروەها زۆر بە دڵسۆزی لە خزمەت ڕایی بونی کاروبارەکانی دەوڵەتدا بوون، لە بوارەکانی سیاسی و ئابوری و ڕۆشنبیری و ڕێکخستن و...هاوکاری دەوڵەت بوون؟!لەسەرو هەمووشیانەوە (حاييم ناحوم أفندی) کە ناوبراو حاخامی تورکیا بوو،پاش وێرانکردنی تورکیاو هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی،لەلایەن ئەتا تورکەوە ڕەوانەی میسر کرا، هەتا لەو وڵاتەشدا ئاشێکی تری دژ بە ئیسلام بخەنە کار بە ئاراستەی وێران کردنی میسریش هاوشێوەی تورکیا،بێ

---

[٦٠]- بروانە: (الافعى اليهودية لعبدالله التل،ص٨٥-٩٦).

گومان لە ڕۆژانی حوکمی ڕەشی جەمال عەبدوناسریشدا ئەم حاخامە لە پشت پەردەوەو بە نهێنی ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە ئاڕاستە کردنی ئەو تاغوتەی میسردا بۆ چەوساندنەوەی موسڵمانان و ئەنجامدانی ئەو هەموو قەسابخانانە لە دژی برایانی موسڵمان.؟!

هەر سەبارەت بە پەیوەندی ئەتا تورك بە جولەکەوە (لیفی أبو عسل) لە کتێبەکەیدا[٦١] دەڵێت: مستەفا کەمال هەموو دەروازەکانی تورکیای بەڕوی جولەکەدا کردەوە،هەمان کات لە ڕێکخستنەوەی زانکۆکانی تورکیادا، پشتی بە جولەکەکان دەبەست، هەروەك ئەتا تورك مەبەستی بوو زانکۆکان بەرەو دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان ئاڕاستە بکات!

هەر لەم بارەوە یەکێك لە نووسەرکانی جولەکە دەڵێت: پێش ئەوەی کار بۆ پڕۆژەیەکی جیهانی بەناو بانگ بکەین،پێویستمان بە زانکۆیەك هەیە لەپێناو بەکارهێنانی وەك حەشارگەو پەناگەیەك، تا توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی تیادا ئەنجام بدەین،پاشان پێویستمان بە چل مامۆستای زانکۆ هەیە کە جولەکە بن، بەمەبەستی فراوان کردنی بەشەکانی زانکۆکە، لەو کەسانەش کە پێویستن، ئابوریناسی بەناوبانگ (ریك)،ناوبراو خاوەن پێگەو توانایەکی گەورەیە لە زانکۆی (ماربورج) دا،زیادە ڕۆیی نیە ئەگەر بڵێم ئەو نووسەرە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە گەورە نیشاندانی سروشتی جولەکەدا.؟!

بێ گومان هیچ کات گۆڕانکاری لەسروشتی ئەم جولەکە خراپەکارانەدا ڕوو نادات، دەست لە هەر شتێك بدەن دەیشێوێنن و وێنای ناشیرین دەکەن، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا

---

[٦١] - بڕوانە: (يقظة العالم اليهودي، ص٢٥٣-٢٥٩) دا.

ٱللَّهُۚ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾ المائدة: ٦٤. واته: هەرچەند ئاگری شەڕیشیان هەڵگیرساندبێت، خوا بۆ خۆی کوژاندویەتیەوە و نەیان توانیوە زیانت لێ بدەن، هەمیشە لە ولاتدا لە هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی فەساد و خراپە و گێرەشێوێنی، بێ گومان خواش خەڵکی خراپەکار و گێرەشێوێنی خۆش ناوێت.[٦٢]

هەروەها (ئیلی لیفی) دەڵێت: مستەفا کەمال باڵەکانی دەهاتنە لەرزە بۆ سۆزو و بەزەیی هاتنەوەی بە جولەکەدا، لەبەر ئەوە ڕێگەی بە ژمارەیەکی زۆریاندا کە بێنە ناو خاکی تورکیاوەو بەهەموو ناوچە جیاوازەکانی ولاتدا بلاو ببنەوە، پاشان ئیلی لیفی دەڵێت: دەگونجێت ئەتا تورك لە بنەڕەتدا جولەکە بێت، بێ گومان ئەو هەموو ڕێز گرتنەی ئەتا تورك لە جولەکەکان، دەکرێت بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە لە نەژادی ئەوان بێت، بە دڵنیاییەوە ئەو بەزەیی و سۆز و میهرەبانیە تەنها لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەتا تورك لە نەژادی جولەکەکانە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە ئەوەندە دڵی پێیان دەسوتێت.

پاشان دەست دەکات بەزیادە ڕۆیی کردن لە پیاهەڵدانی ئەم بەکرێ گیراوەدا و دەڵێت: بەدرێژایی ڕۆژگار کەسێکی تری هاوشێوەی ئەو ئاشتیخوازە دروست نابێتەوە.

شتێکی نەگونجاوە بۆ جولەکەیەك هەر لە خۆیەوە بەو شێوازە بە ئەتا تورکدا هەڵبدات.

بەو شێوەیە "ئیلی لیفی" دەڵێت: (حاییم ناحوم)ی حاخامی جولەکە لەلای مستەفا کەمال و سەرجەم وەزیرەکان و ئەنجومەنی حەل و عەقد

---

[٦٢]- تەفسیری ڕامان.

پێگەیەکی گەورەی هەبوو، هەر لەبەر ئەوە بوو، لە زۆربەی کارەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا.

هەروەها دەڵێت: لە گرنگترین دەسکەوتەکانی حاخامەکەمان،لابردن و شکاندنی هەموو ئەو مەرج و بەربەستانە بوو کە لەبەردەم کۆچی جولەکەکاندا لە تورکیاوە بەرەو فەلەستین دانرا بوو، هەروەك بەشداری کردنی لە کردنەوەی زانکۆیەك لەبواری هەندەسەی ئیسرائیلی لە حەیفادا، سەرباری ئاسانکاری کردن بۆ جولەکەکان لە بواری تاپۆ کردنی خانو و زەوی و زار لەسەریان.

هەروەك کەمال ئەتا تورك (حاییم ناحوم) ی بە نوێنەرایەتی تورکیا رەوانەی کۆنگرەی لاهای کردوە،لە رێکەوتننامەی لۆزانیشدا یەکێك بوو لە نوێنەرەکانی تورکیا،پاشان ئەتا تورك دەیویست وەك وەزیرێکی هەڵبژاردە لە واشنتۆن دایبنێت، بەڵام حاخام داوای لێ بوردنی کردو ئەو کارەی رەت کردەوە، هەروەها لە هاوکاری کردنی سەندیکای داگیرکاری ئیسرائیلیدا لە ئەنکەرە رۆڵێکی کارای هەبووە.

وورد ببنەوە بزانن ئەم حاخامە لەسەردەمی مستەفا کەمالی ریسوادا چ رۆڵ و دەستەلاتێکی بەرفراوانی پێدراوە.

ئایا چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەم ریسوایەی کە ناوی (ئەتا تورکە) لەگەڵ ئەو جولەکانەی کە برای مەیمون و بەرازن.؟!

پاشان دەڵێت: ئەو کودەتایەی تورکیا کە لە ساڵی "١٩١٨" دا برای گەورەم (مستەفا کەمال) ئەنجامی دا،بەو کارەی سودی بە هەموو گەل گەیاند؟! بێ گومان دەسەلاتی سوڵتان عبدالحمیدی هەڵوەشاندەوە، خەلافەتی ئیسلامی لەناو بردو دادگا شەرعیەکانی پوچەڵ کردەوەو،ئاینی ئیسلامی وەلا خست و وەزارەتی ئەوقافی هەڵوەشاندەوە..!!

ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ماسۆنیەت لەناو هەموو گەلێکدا گیانی بەرخودان و بەرگری کردن دەچێنێت،لەناو پیاوانی ماسۆنیەتدا کێ هەیە بتوانێت ئەو ڕۆڵەی ئەتا تورك بگێڕێت لە ڕابردو و داهاتودا؟[٦٣]

٧- بێ گومان کەمالیەکان و ئیتیحادیەکان، چەوسێنەرەوەو ئازار دەری هەموو گەلان بوون، جگە لە جولەکەکان.

لەم بارەوە شێخ مستەفا سەبری دەڵێت: لەناوخۆ و دەرەوەی تورکیادا هیچ گەل و میللەتێکت چاو پێ ناکەوێت کە کەمالیەکان و ئیتیحادیەکانیان خۆش بوێت،جگە لە جولەکە.؟!

بە دڵنیاییەوە لەناو تورکیادا هیچ گەل و نەتەوەیەکت دەست ناکەوێت کە بەدەستی کەمالی و ئیتیحادیەکان نەچەوسێنرابێنەوە، جگە لە جولەکەکان، هەموو نەتەوە جیاوازەکانی تورکیا لە ئەلبان و عەرەب و کوردو تورك و ئەرمەن و... هەموویان لەو ماوەیەدا ستەم و ئەشکەنجەو ئازاریان ڕوو بە ڕوو بوەتەوە، جگە لە جولەکەکان.[٦٤]

٨-باڵا دەست بوونی جولەکە لە تورکیادا، پاش مردنی ئەتا تورکیش بەردەوام بوو، دوای ئەوەی عیسمەت ئینو نو دەسەڵاتی گرتە دەست.

(عەدنان مەندەریس) سەرۆکی پارتی دیموکرات و هەمان کات سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو لە ساڵانی "١٩٥٠-١٩٦٠"،ئەو دێتە گۆو دەڵێت: لە کاتێکدا لەهەوڵدا بوین بە ئاڕاستەی گەڕاندنەوەی چەند دروشمێکی ئیسلامی، وەك: بانگدان بە زمانی عەرەبی و، ئازادی باڵا پۆشی و، وتنەوەی وانە ئیسلامیەکان و...، هەروەك لەو ماوەیەدا مەندەریس لە گەڵ عەرەب نزیك بویەوە دژبە قەوارەی زایۆنی،هەروەها چاودێری توندی خستە

---

[٦٣]- بڕوانە: (الافعى اليهودية،ص٩٦).

[٦٤]- بڕوانە: (الاتجاهات الوطنية).

سەر دەرمان و هەموو ئەو شمەك و كالاَيانەی كە لە ئيسڕائيلدا دروست دەكران،هەمان كات مەندەريس لە ساڵی "١٩٥٦" دا باڵيوٚزی قەوارەكەی لە توركيا وەدەرناو،ئيدی ليٚرەوە بە سەروٚكايەتی (ئەحمەد ئەمين بالمان) هيٚرشيٚكی توندی ڕاگەياندن لەدژی مەندەريس دەستی پیٚ كرد،(ئەحمەد ئەمين بالمان) كەسيٚكی بە ڕەگەز جولەكە بوو، بەردەوام لە ڕوٚژنامەكەيدا خەريكی ئاژاوەو كاری تيٚكدەرانە بوو،هەمان كات لەلايەن جەمسەرەكانی جولەكەی دوٚنمەوە بەئاشكرا هاوكاری دەكرا،بەم شيٚوەيە كارەكان گەيشتنە ئاستيٚكی مەترسيدارو تا ئەو ئەندازەيەی جولەكەی ماسوٚنی بە ئارەزوی خوٚی جوڵەی بە سوپا دەكرد،جوڵە پيٚكردنی سوپا بە سەركردايەتی (جمال جورسيل) بوو،ناوبراو ژەنەڕاڵيٚكی ماسوٚنی بوو،سەرئەنجام لە ساڵی "١٩٦٠" دا عەدنان مەندەريس لەسيٚدارە درا.

سەبارەت بەهوٚكاری لەسيٚدارەدانی مەندەريس، ڕوٚژنامەنوسيٚكی جولەكە بەناوی (سامی كوهين) لە ڕوٚژنامەی (جوين كرونيكل) ی لەندەنيدا دەڵيٚت: هوٚكاری سەرەكی لە سيٚدارەدانی مەندەريس بوٚ نزيك بونەوەی بوولە جيهانی ئيسلامی،كە هەموو سياسەتيٚكی بەو ئاڕاستەيەدا بوو، هەمان كات دڵڕەقی ئەو بەرامبەر بە ئيسڕائيل تا دەهات زياتر دەبوو،ئەمە سەرباری ئەوەی پەيوەندەكانی توركيا و ئيسڕائيلی بەرەو لاوازی برد.

٩- لەكاتيٚكدا (سليمان ديميريل) لە هەوڵی نزيك بوونەوەدا بوو لەگەڵ عەرەب و بەنيازی كەم كردنەوەی پەيوەنديەكانی بوو لەگەڵ قەوارەی زايوٚنيدا، هەمانكات لە خوٚپيشاندانی ڕيباتدا بەشداری كرد دژ بە سوتاندنی مزگەوتی قودس، دوبارە جولەكە ماسوٚنيەكان لەناو سوپادا كەوتنەوە جوڵەوپاشان"ديميريل" لە سەروٚكايەتی ئەنجومەنی وەزيران دوورخرايەوە.

۱۰- ژوری بازرگانی و پیشەسازی تورکیا،دکتۆر نەجمەدین ئەربەکانی بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە هەڵبژاردو کرایە سەرۆکی ژورەکە،ناوبراو مامۆستای کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی ئەستەنبوڵ بوو، پاش وەرگرتنی پۆستەکە هەرجۆرە ئاڵوگۆڕێکی بازرگانی بۆ جولەکەکان لەفەلەستیندا قەدەغە کرد، دەسبەجێ و لەلایەن حکومەتەوە و بەشێوەیەکی ناڕەوا لە پۆستەکەی دور خرایەوە،پاشان کاری کرد بە ئاراستەی دامەزراندنی پارتێکی سیاسی بەناوی پارتی (نظام)و دواتر ئەو پارتەش هەڵوەشێنرایەوەو، ناوبراوپارتی ئاشتیشی دامەزراند.

۱۱- پارتی ئاشتی زۆر بە توندی دژی جوولەکەو قەوارەی زایۆنی وەستایەوە ؟ چونکە کار گەیشتبویە ئەو ئەندازەیەی هێڵی گواستنەوەی تایبەت بە ئیسرائیل لە ئەستەنبوڵدا پشکنینی بۆ نەدەکراو، ئەمە جگە لەوەی دەزگا هەواڵگریەکانی قەوارەی زایۆنی (موساد) بە ئارەزوی خۆیان هات و چۆیان دەکرد، بەشێوەیەك باڵوێزخانەی قەوارەی زایۆنی لە ئەنکەرە بوو بوو بە گەورەترین بنکەی سیخوڕی کردن.

سەرئەنجام پارتی ئاشتی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا پەردەی لەسەر کاری جولەکە هەڵماڵی و دەستی کرد بە ئابڕووبردنیان و بە توندی دابەزییە سەر حکومەتی تورکیا؟ چونکە حکومەت دوانزە جار لەگەڵ جولەکەدا کۆبونەوەی ئەنجامدا بوو!،هەمان کات ڕۆڵی جولەکەی ئاشکرا کرد بە ئاراستەی تێکدانی پرۆگرامەکانی خوێندن و تێکەڵ کردنی کوڕ و کچ لە قوتابخانەکاندا، بەنیگەرانیشەوە باسی لەوە کرد جولەکە لە هەوڵی بەدڕەوشت کردنی ڕۆڵەی موسڵماناندایەو کار بۆ نەهێشتنی هەموو بەهاو ڕەوشتێك دەکەن لەناو کۆمەڵگای تورکیدا.

له کۆتاییدا پارتی ئاشتی لـه "٧ی سێپتەمبەری ١٩٨٠" دابە بەشداری زیاتر له سەدو پەنجا هەزار کەس هەستا بە ئەنجامدانی خۆپیشاندانێکی بـەرفراوان لـە دژی قـەوارەی زایـۆنی، خۆپیـشاندەران ئـالآی ئیـسڕائیلیان سـوتاند، ئیـدی لێـرەوە شـانەکانی دەزگـای هـەواڵگری موسـاد دوبـارە کەوتنەوە جوڵەو، سەر ئەنجام کۆتاییان بەو حکومەتـەش هێنا،تەنها پاشـی پێـنج ڕۆژ لەخۆپیـشاندانەکە، واتـە لــە "١٢ی سـێپتەمبەری ١٩٨٠" دا (بکنعـان أیفـرین)یـان هێنایـە پێشەوە، بـە ئامـانجی وەسـتاندنی تـەوژمی ئیـسلامی لــە تورکیـادا، نـاوبراو بویــە پـارێزەی ڕژێمـی کــەمالیزم و بەرژەوەندیەکانی ئەو جولەکانەی کە دەستیان بە خوێنی گـەلی تورکی سور بوو بوو.؟!

له نمونەی ئـەو جولەکانـەی بەردەوام لـە دەوروپـشتی ئـەتا تورکـدا بون، وەك: (ڕوشـدی ئاراس) ی وەزیـری دەرەوەو هـەروەها جاویـدو فید،هەروەك حـسێن جاهیـدو یـونس نـادی،بێ گومـان یـونس نـادی یـەکێك بـوو لـە ڕاگەیاندکارەکان، ناوبراو بۆ ماوەیەکی دورو درێژ دژایەتییـەکی بێ وێنـەی خەڵکی تورکیای کرد.

سەبارەت بەو جولەکانەی کە زۆر نزیك و دۆسـتی ئـەتا تـورك بـون،(حینـا صفت) صفوت، نمونـەی ئـەو کەسـانەیە،ئەو یـەکێك بـووە لـەو سـێ کەسەی زۆر نزیك بون لە ئەتا تورکـەوە، هـەمان کات سـکرتێری پـارتی گـەلی فـەرمان ڕەوا بووە.

هەروەها نموونەی ئەو جولەکانەی دیکە (ماتر سالم)ە، ئەم پیاوە یەکێکە لە ئەندامانی بانکی (سلانیك) لە ئەستەنبوڵ، ئەم ناپاکە لەڕێی کارەکەیەوە بەردەوام خـەریکی هەڵلوشـینی دارایـی تورکیـا بـوو، ڕێکخـەرو خۆشـکەری ئەو هەلە سیاسیە بوو،هەروەها دۆسـتە داوێـن پیسەکەی کە نـاوی (خالـدە

أديب)ە، یەكێكی تر بوو لەوانەی بە دەوروپشتی ئەتا توركدا دەهاتن، هەروەك ئەم ئافرەتە بەد ڕەوشتە وەزیری ڕۆشنبیری بوو،هیچ كات ئەم ئافرەتەی لەلا بوایە،ئەتا تورك گەشبینی خۆی نیشان دەدا بەرامبەر بە سەركەوتنەكانی.؟!

جێی ئاماژەیە پێش شانۆگەریەگەی جەنگی (ئەفیون)،ئەم ئافرەتەی بەرچاو نەكەوت وەك جاران سەردانی نەدەكرد، پاشان ناردی بە شوێنیداو، پاش ئەوەی گەیشتە كۆشك، ئەتا تورك وتی: ئێستا لەسەركەوتنم دڵنیام.!كام سەركەوتنە؟. ئەو سەركەوتنەی دوژمنانی ئیسلام بە شانۆو فرت وفێڵ بۆ بەرز كردنەوەت بۆیان داتاشیت؟!.

هاوسەری ئەتا تورك (لەتیفە هانم)، ناوبراو كچی یەك لە دەوڵەمەندە بە ناو بانگەكانە، خەڵكی ئەزمیرەو پەیوەندییەكی بەهێزی لەگەڵ جوەكانی ئەزمیردا هەبووە.

هەروەها لەو جولەكانەی تر (موئین كوهین)ە، لەسەرەتاكانی ساڵی "١٩٢٢" دا دەستی كردوە بە كاری ڕۆژنامەنوسی،دواترو لە ساڵی"١٩٤٦" دا بووە بە ئەندامی هەرێمی پارتی گەلی كۆماری لە ئەستەنبوڵ،لە ساڵی "١٩٤٨" یشدا یەكێك بووە لەو سێ نوسەرە جولەكانەی خەلاتی ڕێز لێنانیان پێ بەخشراوە، دواجارو لەساڵی "١٩٦٢" دا كۆچی دوایی كردوەو ناوبراو دامەزرێنەری كۆمەڵەی كەلەپوری توركی بووە، هەمان كات (موئین كوهین) نوسەری سێ كتێبە بە ناوەكانی (سیاسة التتریك، الكمالیة، الروح التركیة).

لــەگرنگترین وتــە بــەناو بانگــەکانی (مــوئین کــوهین): ئــەو کەســەی نوێنەرایەتی کەمالیزم دەکات و لەو پێناوەدا هەوڵ دەدات، هەر بە تەنها مرۆڤێك نیىە، بەڵکو لەسەرەوەی مرۆڤەوەیە.[٦٥]

هــەروەها دەڵێــت: ئــەو خودایــەی کــە هــەر لەســەرەتاوە کــەمالیزم پەرستویەتی، نەتەوەیە.؟!

هــەروەك لــە وتەیــەکی دیکەیــدا دەڵێــت: پــێش دەســت کــردن بــەبنیات نان،پێویستە گۆڕەپانەکە لە ئاین و خەلافەت پاك بکەینەوە،لە ڕاستیدا ئەمانــە دوو لەمپــەڕی زۆر ترســناکن لەبــەردەم بــەرەو پــێش چــوونی کارەکانماندا.

هــەروەها دەڵێــت: کــەمالیزم یەکــەمین هێرشــی خــۆی ئاڕاســتەی فەرمانڕەوایی ئیسلامی کرد!؟ بەیەك لێدانی ئەتا تورك ئەو دەسەڵاتە زۆرداره لەناو برا.؟!

---

[٦٥] - بڕوانە: (الکمالیة، موئیر کوهین، ص٨٩–٩٠).

## بەڵگەنامەی باڵیوزی بەریتانی ( لاوزەر) ساڵی ( ١٩١٠ ) بلاوی کردوەتەوە، سەبارەت بە پەیوەندی ئیتیحادیەکان و جولەکە و ماسۆنیەتی جیهانی:

ئەم بەڵگەنامە نهێنیەی بەردەستتان،لە بنەڕەتدا بروسکەیەکی نهێنی بووە، کە باڵیوزی بەریتانی لە قوستەنتینیە (السیر جبرار لاوزر) لە ڕێکەوتی "١٩١٠/٥/٢٩" ئاراستەی (السیرش هارونج)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانی کردووە، بروسکەکە زانیاری ورد لەخۆ دەگرێت،دەربارەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی وجولەکەو ماسۆنیەتی جیهانی.

ئەم بروسکەیە لەلایەن سەندیکایەکی بەریتانییەوە ئاشکرا کراو،دواتر لەژمارە "٤٢٩،٤٢٥"ی گۆڤاری (المجتمع الکویتی) داو لە ڕێکەوتی"١٩٧٨/١٢/٢٥" دا بلاو کراوەتەوە،شیاوی باسە ئەمیش لە گۆڤاری (آفاق العراقیة) وە، بروسکەکەی وەرگرتبوو،لێرەدا گرنگترین بەشەکانی دەخەینە ڕوو:

*لەشاری (سلانیك) دا سەدو چل هەزار کەس دەژی،لەو ڕێژەیە هەشتا هەزار کەسیان جولەکەی بە نەژاد ئیسپانین و لەو ولاتە هەڵهاتون،بیست هەزار کەسیان جولەکەی دۆنمەن،زۆرینەی جولەکەکانی ئیسپانیا سودمەند بون لە وەرگرتنی ڕەگەزنامەی ئیتاڵیدا،ئەوانیش ماسۆنیەکانن کە دەدرێنە پاڵ مەحافیلە ئیتاڵیەکان، ئەمانیش لەبەر ئەوە سود لەو حەسانە یاساییانە وەردەگرن کە دەوڵەتی عوسمانی بە کەسانی بێگانەی دەبەخشێت، لە دژی پشکنین و ڕاوەدونانیان.

*( **قرەصو** ) پێش چەن ساڵێك لە (سلانیك) داو بە هاوكاری ماسۆنیەتی ئیتاڵی مەحفەلی (ماسیدونیا روزیتا) یان دامەزراند،شیاوی باسە (قرەصو) جێگری گشتی زایۆنیزم بوو لە توركیا، هەروەك ناوبراو زانایەكی گەورەی جولەكە بوو!ئەو پیاوانی (تركیا الفتات) ی ڕازی كرد بەوەی پشتگیری و پشتیوانی لە ماسۆنیەت بكەن،تەنها ئامانجیش لێرەدا سەپاندنی هێزی جولەكە بوو لە توركیادا.

* ئەوە ئاشكرایە كە نەخشە داڕێژەرانی (تركیا الفتات) لە (سلانیك)ن، زۆرینەشیان لە كەسانی جولەكە پێك هاتبون.

*لەپاش شۆڕشی "١٩٠٨"ەوە،ئەو ڕاستیە دەركەوت كە زۆربەی سەركردەكانیان ماسۆنی بوون.

*هەموو جولەكەكان بە پەرۆشەوە پاڵپشت و پشتیوانی سەردەمی نوێ بوون.

*هەموو جولەكەیەك خۆی بە سیخوڕی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی دەزانی.

* خەڵكی دەیانگوت: بزوتنەوەی جولەكە لە توركەكان زۆرترن.

*ئیتاڵیا (بریمولیفی) جولەكەی دەست نیشان كرد،هەتا ببێتە قونسوڵی گشتی لە (سلانیك) دا،هەروەها ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا (أوسكار شتراوس) ی كردە باڵیۆزی وڵاتەكەی لە قوستەنتینیە، باڵیۆزی ئەمریكا بەهاوكاری (جاكوب شنب) ڕۆڵێكی بەرچاوی هەبوولە هاندانی جولەكەكانی ئەمریكا هەتا بەرەو عێراق كۆچ بكەن، (أوسكار شتراوس) یش كەسێكی جولەكە بوو.

*ڕەمزی بەگ کە بیروباوەڕی جولەکەکانی دۆنمەی هەبوو، فەرماندەی ئەو چوار بەتالیۆنەش بوو کە بەتایبەتی لە (سلانیك)ەوە ڕەوانەی قوستەنتینیە کران، هەروەها ناوبراو فەرماندەو بەرپرسی ئەو جەنگە بوو کە دژی سوڵتان موحەممەدی پێنجەم ئەنجام درا،کاتێك سوڵتان عبدالحمیدی دووەم لە کورسی خەلافەت دور خرایەوە و لە (سلانیك) بەند کرا، براکەی ڕەمزی بەگ کرا بەسەرپەرشتیاری سوڵتان لە بەندینخانەدا.

*کۆنگرەی نۆیەمی زایۆنیزم کە لە کانونی یەکەمی "١٩٠٩" دا بەسترا ئەوەی ئاشکرا کرد،کە دابەش بوونی جولەکە بۆ زایۆنیزم وبەرەی کۆچبەران بۆ ناوچەکانی فەلەستین کۆتایی پێ هات، ئەوەش بەبۆنەی سەرکەوتنی (موعجیزەی شۆڕشی تورکیاوە) بوو،بێ گومان لەمەدا ئەو ئاماژەیە هەبوو کە خاکی فەلەستین بۆ جولەکە یەکلا بوەتەوە.

*پاش لادانی سوڵتان عبدالحمید،یاسا عورفیەکان ڕاگەیەندران و بۆ ماوەی دوو ساڵ کاریان پێکرا، هەروەك زۆربەی ئەفسەرەکانی ئەو دادگایانە کەسانی ماسۆنی بوون.

*بەڕێوەبەری چاپەمەنیەکانی دەوڵەت جولەکەیەکی خەڵکی (سلانیك) بوو، دەسەلاتی وەستاندنی هەر گۆڤارو ڕۆژنامەیەکی هەبوو کە خۆی بیویستایە.

*ئاژانسی هەواڵەکان، بەردەوام سەبارەت بە ڕوداوە ناوخۆیی و دەرەکیەکان بۆچوونی ئیتیحادیەکانی وەردەگرت، بەرپرسەکەشی جولەکەیەکی خەڵکی بەغداد بوو.

*سەرۆکی لقی سەرەکی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە قوستەنتینیە، جولەکەیەکی خەڵکی سلانیك بوو.

*بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی دەوڵەت ماسۆنییەکی خەڵکی سلانیك بوو.

*لە مەکدۆنیاو قوستەنتینیە لەماوەی ساڵی "١٩٠٩" دا، دوانزە مەحفەلی ماسۆنی کرانەوە.

*فەرمانبەران و سەرجەم ئەوانەی کەخاوەن پۆست بوون،موچەو پۆستەکانیان پەیوەست بوو بە ماسۆنی بونیانەوە.

*لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی ماسۆنی دەستی ڕاگیربکات لەسەر سوپا، ئەفسەرانێکی زۆری ناردنە ناو سوپا (بە تایبەت ئەوانەی کە پلە نزم بوون) لە مەحفەلێکی ماسۆنیدا کە ناوی (ریسنا)و شوێنی (نیازی بەگ) بوو، براکانی نەقیب (عوسمان فەهمی بەگ)سەرپەرشتییان دەکرد.

*زۆربەی کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان نوێنەری خۆیان ناردە ناو ماسۆنیەکانەوە.

*نوێنەرانی ئۆپۆزسیۆن و بەتایبەت عەرەبەکان، ئەنجومەنی تایبەتیان بۆ دادەمەزراند، وەك: ئەنجومەنی برایەتی عوسمانی وهاوڕێیانی ئازادی.

*لەماوەی ساڵانی "١٩٠٩-١٩١٠"دا ئەم ئەنجومەنە ماسۆنیانە دامەزراون: (الوفاء الشرقی، نهضة بیزنطة، الاصدقاء الحمیمون للاتحاد والترقی، الحقیقة، الوطن، النهضة، الفجر)، پێویستە ئاماژە بەوە بدەین سەرجەمی ئەنجومەنە ماسۆنیەکان بۆ نموونە، وەك: تۆڕی ئەنجومەنە ماسۆنیەکان لە مەکدۆنیاو سلانیك دا، هەموو ئەمانە جولەکە نەخشەکەی داڕشتون و پێشڕەوایەتی کردون.

*سەعید حەلیمی میری میسرو عەباس حەلیمی برایی ومیر عەزیز حەسەن، ئەمانەش کەسانی ماسۆنی بون.

*ئیــدریس بــەگ ڕاغیــب، ســەرۆکی میحفــەلی گــەورەی میــسر،کە دامەزرێنەری چەندین ئەنجومەنی ماسۆنیە لە هەریەکە لە ولآتانی: میسر و سوریا و فەلەستین و لوبنان.

*زۆربەی ڕۆمە کاسۆلیکەکانی دانیشتوی لوبنان ماسۆنی بوون.

*موحەممــەد ئــورفی پاشــا،ژمارەیەکی زۆری ئەنجومــەنی ماســۆنی لەهەریەکە لە ولآتانی میسرو قودس و باشوری سوریا دامەزراندوە.

* هەروەها (یوسف بەگ السکاکینی) لە گەورە بەرپرسانی ماسۆنی بوو.

* سەرکردەی نیشتیمانی میسری (محمد فرید) ناوبراو ماسۆنیەکی پایە بڵند بوو، ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە بەرەو پێش بردن و فراوان کردنی ئەنجومەنە ماسۆنیەکاندا،لەهەریەکە لە میسرو تەنتا.

* حاخام (حاییم ناحوم)، سەرپەرشتی گەورەترین هۆزی جولەکەی دەکرد لە تورکیادا،ناوبراو هاوڕێی زانکۆیی بەشێك لە ئەندامانی بالآی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بوو.

* تەلعــەت و جاویــد لەســەر ئاســتی بــالآی تورکیــا نوێنەرایــەتی ماسۆنیەتیان دەکرد،بێ گومان جاویدیش کەسێکی جولەکە بووە.

* پێش ساڵێك لە دەست بەکار بونی تەلعەت،وەك وەزیری ناوخۆ، بەچڕی دەســتی کــرد بــە بلأوکردنــەوەی تــۆڕی ماســۆنیەت لەهــەموو ناوچەکانی دەوڵەتدا، لەو بارەوە چەندین ئەرك و لێپرسراویەتی گەورەی هەرێمەکانی بە ماسۆنیەکان بەخشی.

* لاوزەر دەڵێــت: لێــرەوە ئــەو ڕاســتیە دەردەکــەوێت کــە حکومــەتی شاراوەی تورکیا،بوەتە گەورەترین لانکەی ئەنجومەنەکانی ماسۆنیەت لە ڕۆژهەلآت دا، بێ گومان لەم بارەوە مامۆستای گەورە (تەلعەت بەگ) ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە.

* ماسۆنیەت چالاکیەکانی بەرەو فراوان بوون دەچوون، بەشێوەیەك لە تورکیاوە بەرەو ئێران پەلی دەهاویشت،هەمان کات ئەنجومەنی ماسۆنیەت لە پشت ئەو کودەتایەوە بووکە لە ئێراندا ڕوویدا، هەروەها باسی ئەوە دەکرا کە مەحفەلێکی ماسۆنی ڕۆژئاوایی لە ئێران بکرێتەوە، (فرح الله خان) کە سەرپەرشتی کارەکانی باڵوێزخانەی نوێی ئێرانی لە قوستەنتینیەدا دەکرد،پەیوەنی کرد بە ماسۆنیەتەوە.

* جولەکە زۆر گرنگی دەدەن بەپاراستنی هێزیان لەناو ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیای نوێدا.

* جولەکە بە بەردەوامی زۆر گرنگی دەدا بە هەڵگیرساندنی ئاژاوە و فیتنە ودووبەرەکی لەنێوان تورکەکانی نەیارانی جولەکەی داگیرکەردا..

* بازرگانەکانی جولەکە بەخۆشحاڵیەوە ئامادەی پێدانی قەرز بون بەتورکیا،لەبەرامبەر قازانج و دەسکەوتی ئابوریدا.

* لە ڕۆژئاواشدا جولەکە خۆیان سەپاند بوو بەسەر کاروباری ڕۆژنامەگەری دا.

* جولەکە بە بەردەوامی لە هەوڵی بەدی هێنانی ئامانجە باڵاکانی ئیسرائیلدا بوون،لە داهاتودا.

* جولەکە بەتوندی لە هەوڵی کونترۆڵ کردنی لاوانی تورکیادا بون.

* جولەکە ئەرکی چاپ کردنی ڕۆژنامەی (ترکیا الفتاة) و چەند ڕۆژنامەیەکی تری قوستەنتینیەیان لە ئەستۆ گرتبوو.

* زۆربەی بازرگانە دەوڵەمەندەکانی ئەوروپا جولەکە بوون، تورکیا داوای چەند پارەی بکردایە بەقەرز پێیان دەبەخشی.

* کۆمەڵـەی ئیتیحـاد و تـەرەقی و ماسـۆنیەکان هـانی شۆڕشـگێرە جولەکەو ئەرمەنەکانیان دەدا، کە ئاژاوەو نا ئارامی لە ڕوسیای قەیسەریدا دروست بکەن.

* جولەکە کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی ئاڕاستە دەکرد،کەلە گرتنە بەری هۆکارەکاندا لاسایی شۆڕشی فەڕەنسی بکەنەوە.

* جولەکـە ڕێخۆشـکەر بـوون بـۆ تورکـەکان تـا تێکـەڵی هەنگارییـەکان بکەن،پاڵنـەری ئەمـەش ڕەگـەزی تۆرانیـەکان بوو؟چـونکە هەنگارییـەکان دەگەڕانەوە سەر تۆرانەکان.

هـەموو ئـەم زانیاریانـەی ئاماژەمـان پـێ کـردن، لەڕێگـەی ماسـۆنیە ناوخۆییەکانەوەو لەکارێکی زۆر نهێنیدا بەدەستمان گەیشتون.

بەم شێوەیە بەڵگەنامەکەی وەزیـری دەرەوەی بەریتانی (لاوزەر) کۆتـایی هات،کە ساڵی "١٩١٠" نوسیویەتی.

# فەرمانڕەوایی کەمال ئەتـاتورك بۆ تـوركیا :

١-بەدرێژایی مێژوو کەمال ئەتا تورك یـەكێك بووە لـەو کەسانەی کە بە شێوەیەکی ڕەهایی فەرمان ڕەوایی تورکیای کردووە، هەمان کات بە ئـاگر و ئاسن و خوێن ڕشتن ئەو وڵاتەی بەڕێوە بردووە، ئەمـەش ڕاستـەقینەیەکە و زۆرینەمان لەسەری هاوڕاین.

بەردەوام ئەتا تورك بە کچە دڵدارە جولەکەکەی (خالدە أدیب) ی دەگوت: سـەرکەوتووترین ڕژێمـی فـەرمانڕەوایی لـە وڵاتـدا،حوکمی تاکـە کەسـیە، بەمەرجی ئەوەی بەشێوازێکی ڕەها هـەموو دەسـەڵاتەکان لـە دەسـتی خۆتـدا کـۆ بکەیتـەوە، ئیـدی بـەو شـێوازە هـەموو کەسـێك ناچـاری ئـەوە دەبێـت

فەرمانەکات جیٚ بە جیٚ بکات، بیٚ گومان ئەگەر فەرمان ڕەوایی بەشێوەیەکی ڕەهایی کەوتە دەستی تاکە کەسێك، ئەو کات ڕەخنەو ئامۆژگاری لەکەس قبولٚ ناکرێت.

سەرئەنجام هەموو کارو بارەکان ڕێڕەوی ئاسایی خۆیان وەردەگرن و گەلیش ناچار دەکرێت، ئەوەی بوێت کە جەنابی سەرۆك مەبەستیەتی.

بەدڵنیاییەوە کەمال ئەتا تورك بەکردار خۆی کرد بە فەرمان ڕەوای ڕەها، لە کاتی هەڕەشەکانی یۆناندا کە ئاڕاستەی ئەنکەرەی کردن، ئەتا تورك داوای لە ئەنجومەنی نوێنەران کرد بیکەنە سەرۆکێکی ڕەهاو دەسکراوەو هەموو دەسەلأتێکی بدەنیٚ.[٦٦]

٢-بەکارهێنانی ترس و تۆقاندن، بۆ دامرکاندنەوەی شەپۆلی ناڕەزایی هاولأتیان، لەو پێناوەدا بیست و پێنج ئەفسەری لەسێدارە دا.[٦٧]

٣-لەکاتێکدا کێشەی جیاکردنەوەی دەسەلأت لە خەلافەتی ئیسلامی لە ئەنجومەنی نوێنەراندا خرایە ڕوو،ئەتا تورك وتی: پێویستە حوکم و دەسەلأت لە خەلافەت جیا بکرێتەوەو پاشان خەلافەت بە یەکجاری هەڵبوەشێندرێتەوە، ئەگەر ئەنجومەنی نوێنەران لەو بارەوە ڕەزامەندی نیشان بدات یاخود لە دژی ئەو کارە بوەستێتەوە، من وەك ئەتا تورك هەر ئەو کارە ئەنجام دەدەم؟ سەر ئەنجام هەموو ئەوەش ڕوو دەداو سەرێکی ئێوە لەو پێناوەدا لیٚ ئەکرێتەوە؟ پاشان بە ناچاری و بە کۆی دەنگی (الجمعية الوطنية الكبرى) بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی لە

---

[٦٦] - بڕوانە: (ارمسترنج، ص١٦٤).

[٦٧] - بڕوانە: (ارمسترنج، ص١٦٩).

توركیادا پەسەند کرا؟! جا نوێنەرەکان هاواریان دەکرد ئەمە درۆیەکی شاخدارە، بەڵام ئەو گوێی بەکەس نەدەدا.[٦٨]

٤-سەرئەنجام حەسانەی یاسایی لەسەر نوێنەران هەڵگرت چاودێری توندی خستە سەر ڕاگەیاندن پاش ئەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی هەڵوەشاندنەوە، کاتێک ناڕەزاییەکان توند بوونەوە، ئەنجومەنی نوێی نوێنەران هەڵبژێردرا، بەڵام ئەنجومەنەکە ناڕەزایی زیاتری لێ کەوتەوە، لێرەوەو بۆ دەرباز کردنی ئەتا تورك لەو دۆخە ناهەموارەی کە تێی کەوتوە، ڕێکەوتننامەی لۆزان هێنرایە ئاراوە، گفتوگۆکانی لۆزان ماوەی سێ مانگ درێژەیان کێشا، لە نۆڤەمبەری ساڵی "١٩٢٢"بۆ فبرایەری "١٩٢٣"،بێ گومان ڕێکەوتننامەی لۆزان زۆر توند لەسەر گەلی توركی کەوت، ئەوان لە دەرئەنجامی ئەو ڕێکەوتنە نەفرین لێ کراوەوە گرنگترین گەوهەری خۆیان لە دەست دا، کە بریتی بوو لە وەلانانی ئیسلام و ڕمانی خەلافەتی ئیسلامی، دوژمنانی ئیسلام ئەم خاڵەیان بە نهێنی لەناو خۆیاندا هێشتەوە، تا ساتی جێ بە جێ کردنی؟! بەڵام ئەوەی لە خاڵەکان ئاشکرا کرا، چەند شتێکی لاوەکی بوون، بە بەراورد بە ڕماندن و لەناودانی خەلافەت،وەك: کشانەوەی دوایین سەربازی هێزەکانی ئینگلیز لە پایتەخت و....

٥-ڕژێمی کۆماری ڕاگەیاندرا، ئەمەش دەرئەنجامی گەلەکۆمەیەکی زۆری دوژمنان بوو،ئیدی لێرەوە هەژمونی ئاینی ئیسلامیان لە جومگەکانی ژیانی فەرمان ڕەوایی توركیادا بەزیادە زانی و بڕیاری دورخستنەوەی ئیسلامیشیان لە کورسی فەرمان ڕەوایی دەرکرد،سەرئەنجام ئەو ڕاستیە تاڵەیان جێ بە جێ کرد،کە ڕماندنی خەلافەتی ئیسلامی بوو! پاشان

---

[٦٨]- بڕوانە: (ارمسترنج، ص١٩٤).

یاسایەك دەركرا، بەپێی یاساكە هەموو ئەوانەی كە دژی ڕژێمی كۆمارین یان پشتیوانی لە سوڵتان عبدالحمید دەكەن، بەخیانەتكار دێنە ئەژمارو سزاكەشیان مردنە.

٦-لە "٣" ی مارسی "١٩٢٤" داپڕۆژە یاسای هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و دەركردنی خەلیفە ئاراستەی پەرلەمان كرا،پاشان ئاینی ئیسلام لە هەموو جومگەیەكی فەرمان ڕەوایی دور خرایەوە،هەمان كات سەرجەمی دادگا ئیسلامیەكان ڕوو بە ڕووی داخستن كرانەوەو دادگا دەسكردو هاوچەرخ و مرۆڤ كردەكان هێنرانە پێشەوە، هەموو ئەو قوتابیانەش كە لە حوجرە و تەكیە و قوتابخانە ئیسلامیەكاندا دەیان خوێند، نێردرانەماڵەوەو لەبەرامبەردا بیناكانیشیان ڕادەستی حكومەت كران، تا بۆ بواری جگە لە ئیسلام بەكاریان بهێنێت.

ڕاستەوخۆ و ڕۆژێك پاش ئەوە، بڕیاری دورخستنەوەی خەلیفە لەكورسی فەرمانڕەوایی ڕاگەیەندراو هەموو ئەمیرەكانیشی ڕەوانەی دەرەوەی ولات كران.[٦٩]

٧-پاش هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت هەژاری بەرۆكی ولاتی گرت،خۆراك كەمبویەوەو نرخی شمەكەكان بەرز بویەوە، لەبەرامبەردا پارەش كەم بویەوە، كار گەیشتە ئەوەی كە خۆراك و شمەك و كالاكان لە بازاڕەكاندا كەم بونەوە، گێڵگە كشتوكاڵیەكان ڕوو بە ڕووی لەناو چون بونەوە، بەهۆی كەمی ئالیكەوە ئاژەڵ و مەڕو مالاتێكی زۆر مردار بونەوە، بەو شێوازە ژیانی دانیشتوان بەشێوەیەكی لە ئەندازە بەدەر دوچاری مەترسی بویەوە،

---

[٦٩]- بڕوانە: (ارمسترنج، ص٢١٠).

تا ئەو ڕادەیەی مێژووی وڵات گرانی و نەهامەتی لەو جۆرەی بەبیستنیش بەخۆیەوە نەدی بوو.؟![70]

٨- لێرەدا هەندێك لەو ئەندامانە كە نەیاری بوون پارتێكیان بەناوی (التقدمیون الجمهوریون) یان بەسەرۆكایەتی فەرمان ڕەوای ئەستەنبوڵ دامەزراند،كە ناوی ڕەئوف بوو،لەوكاتەی عیسمەت ئینو نو،هێرشی كردە سەر (كولونێل خەلیل) ئەویش لەو جێگایەدا كوژرا.

پاشان عەلی شوكری هێرشێكی توندی كردە سەر سیاسەتەكانی ئەتا تورك،سەرئەنجام ئەویش لەلایەن عوسمان ئاغای سەرۆكی پاسەوانانی ئەتا توركەوە خنكێنرا وتەرمەكەی لە چۆڵەوانییەكدا فڕێدا،پاش ئەوەی ئەم هەڵوێستانەی ئاشكرا بوون تووشی تەنگەلا بوو، لەبەرئەمە ئەتا تورك عیسمەت ئینونوی لابردوفەتحی ئۆقیای كردە سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

كاردانەوەكان سات بە سات توندتر دەبوون،ئیدی لێرەوەو جارێكی تر بەریتانیا كەوتەوە جوڵە بۆ ڕزگار كردنی بەكرێ گیراوەكەی، لەو پێناوەداو بۆ هێور كردنەوەی بارو دۆخەكە ئاگادارییەكی سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ وروژاند، لێرەوە كوردەكانیش دەستیان كرد بە شۆڕش،ئەتاتورك هاواری كرد كە وڵات لە مەترسیدایە؟! هەستی نەتەوەیی توركەكان لەدژی ئینگلیزو كوردەكان وروژێنرا! سەرئەنجام چل و شەش گەورە بەرپرسی كوردەكان دەستگیر كران و لەسێدارە دران، كە شێخ سەعیدی پیران یەكێك بوو لەو كەسانە،دواتر پارتی (التقدمیون الجمهوریون)، نەیارانی بەوە تۆمەتبار كرد كە پەیوەندییان بەهێزەكانی ئینگلیزەوە هەیە،پاشان

---

[70]- بڕوانە: (ارمسترنج، ص٢١٢).

ئەوانیش لەلایەن دادگای سەربەخۆوەو بەتۆمەتی بەرهەڵستی بونیان لە سیاسەتەکانی، سزای لەسێدارە دانیان بۆ دەرکردن و لەنێویشیاندا ئەو سزایە چوار سەرکردەی سەربازی پارتەکەی گرتەوە.

پاش ئەوەی بڕیاری لەسێدارەکان لەلایەن ئەتا تورکەوە واژۆ کران، دواتر سەرجەمیان لەسێدارە دران،جگە لە چوار سەرکردە سەربازیەکەی پارتی (التقدمیون الجمهوریون) و لە ئەنجامدا ئەمان ئازاد کران،بەم شێوەیە ئەتا تورك لە هەموو ناوچەکانی وڵاتدا فەرمان ڕەواکانی خۆی بلاو کردنەوە.

٩-پاش ئەوەی خۆی خاڵی کردەوە لە دوژمنایەتی کردنی ئیسلا م و وەلانانی خەلافەتی ئیسلامی،دەستی کرد بە سەپاندنی (قبعة) کلاو،بێ گومان ئەمەش ناڕەزایی توندی تورکەکانی بە دوای خۆیدا هێناو بە بۆچونی ئەوان،ئەم کلاوە نیشانەی ئەهلی کوفرە، ئەوانیش ناڕازی بوون بەم کارە.

ئەتا تورك بۆ گەیشتن بە ئاواتە گلاوەکانی و دامرکاندنەوەی ناڕەزایەتی خەڵکی، پەنای بۆ هەموو کارێکی دڕندانە دەبرد، دڕندەییەکەی گەیشتە ئاستێکی مەترسیدارو دەستی کرد بە تۆقاندنی خەڵك وپەتی سێدارەی هاوشێوەی یاری جۆلانەی منداڵان لە گۆڕەپان ومەیدانەکاندا هەڵواسیبوو، یەکێك لەشاهێد حاڵەکان دەڵێت:لەکاتێکدا بەلای ئەو گۆڕەپانانەدا تێپەڕ دەبوم کە خە ڵکەکەی تیادا لە سێدارە درابوو،هەرگیز ئەو دیمەنانەم لەیاد ناچێت کەدەموچای ئەو پیاوە بەتەمەنانەم دەبینی لەسێدارە درابوون و ڕیشی سپییان لەگەل شنەی بادا دەجوڵایەوە؟!!.[٧١]

---

[٧١] - بروانە:(الرجل الصنم.ص٢٣٤)

١٠- پاشـان ئـەتاتورك دەسـتی كـرد بـەهێنانی یاسـا دەسـكردەكانی ئەوروپا، دواتر دەستی كرد بە بانگ كردنـی پسپۆڕ و شارەزایانی یاسایی مرۆڤ كرد، بەمەبەستی هەڵهێنجانی یاساكانی تاوان و مەدەنی و بازرگانی و.. لە یاساكانی وڵاتانی ئیتاڵیا و سویسرا و ئاڵمان.[٧٢]

١١- مستەفا كەمال ئاڵای ڕەگەز پەرەستی توركیای بەرز كردەوە،هەمان كات دەستی كرد بە دوبارە گەڕاندنەوەی بیروباوەڕی بت پەرەستی كۆنی توركـەكان، بـۆ نمونـە:بانگەشـە كـردن بـۆ پەرەسـتنی گـورگی سـپی (بوزقورت)؟! كە وێنەكەی لەسەر پۆستە (بەرید) نەخشێنرا بوو،لەو بارەوە چەندین سرودو هۆنراوە دانران،هەمان كات لە قوتابخانەكاندا جەنگیزخان وەك خـوا نیـشانی قوتابیـان دەدراو ئەمـەش خرایـە نـاو پرۆگرامـەكانی خوێندنەوە، ئەمە جگە لەوەی چەندین كتێب بۆ بلاو كردنەوەی ئەم بەرنامە نەفامیانـە چاپ و بلاو كرانـەوە، لەوانـەش: (خالـدة ادیـب) ی كـچە عاشقی ئـەتا تـورك كتێبـی (طـوران الجدیـدة) ی نوسـی،هەروەك مـوئیز كـوهینی جولەكە كتێبی (الكمالية والروح التركية) ی نوسی.

مـوئیز كوهین لـە وتەیەكیـدا دەڵێـت: ئـەو خوایـەی كـە هـەر لەسـەرەتاوە كەمالیزم پەرستویەتی، بریتیە لە نەتەوە.؟!

هەروەك شاعیری نەتەوەیی (ضیاكوك الب) دەڵێت: مـن سـێ شـتم خـۆش دەوێن،كە بریتین لـە نەتـەوەی تـورك و نەتـەوەی ئیسلامی و شارسـتانیەتی ڕۆژئاوا.

١٢- پاشان نووسینی بە پیتـە عەرەبیـەكان هەڵوەشـاندەوە،ئەو پیتانـەی كە سەردەمێكی زۆر زمانی نوسینی توركەكان بوون،هەمان كات بەهۆی ئـەم

---

[٧٢] - بڕوانە:(ارمسترنج،ص٢٢٦).

پیتە عەرەبیانەوە شارەزای کەلتوور و کەلەپوری ئیسلامی لە تەفسیر و فەرمودە و فیقهو مێژوو ...دەبوون، دواتر پیتە لاتینیەکانی کردنە زمانی فەرمی نوسین لەتورکیادا؟هەتا کۆمەڵگای تورکی لە ئاین و کەلتورە ئیسلامیەکەیان دابڕێت.

پاش ئەوەی بڕیاری جیٚ بەجیٚ کردنی ئەو یاسایەیشی دەرکرد،دواتر ڕۆژێکی دەستنیشان کرد،هەتا سزای هەموو ئەو کەسانە بدات کە پابەند نابن بە بڕیارەکەوە و پیتی لاتینی بەکارناهێنن لەنوسیندا،سزاکەش لە دەرکردن لە وەزیفەوە دەستی پیٚ دەکرد، بۆ وەرگرتنەوەی ڕەگەزنامەو بەندکردن و دەرکردنی کەسی سەرپێچی کار لە وڵات.؟![٧٣]

١٣-فرە ژنی قەدەغە کرد،هەمان کات یەکسانی ژن و پیاوی لەسەر جەم کایەکانی ژیانداو لەئەرك و مافدا ڕاگەیاند؟چەندین قوتابخانەو دامەزراوەی هونەرە جوانەکانی بۆ کوڕان و کچانی لاو کردەوە! هەروەك بۆ ئاشنا کردنی کوڕان و کچانی تورکیا بە سەمای شەرقی و غەربی، چەندین قوتابخانەی لەو بارەوە کردەوەو، ئافرەتیشی لە ناو خێزان و لەپەروەردەکردنی منداڵەوە دەرهێناو ڕەوانەی دام و دەزگا حکومیەکان و شوێنە گشتیەکانی کرد،هەروەها گرنگی دا بەفراوان کردنی ئەو شوێنانەی کە ڕێگە خۆشکەری تێکەڵ بونی کوڕان وکچانن،هەروەك ئاسانکاری زۆریشی دەکرد بۆ سازکردنی ئاهەنگی تایبەت بەسەما کردن.؟!

١٤-سەبارەت بە دوو مزگەوتە گەورەکەی تورکیاش، مزگەوتی (أیا صوفیا) و مزگەوتی (فاتیح)، ئەم تاوانبارە نەگریسە،هەردوکیانی کرد بە مۆزەخانە؟!.

---

٧٣- بڕوانە: (ارمسترنج،ص٢٣٤).

١٥- کێڵگەیەکی گەورەی نمونەیی دروست کرد،دەستی کرد بە بەخێو کردنی بەراز و مانگا تیایدا، بێ گومان ئەمەش بێ ئەدەبییەکی تری ئەو بوو لەگەڵ ئیسلام و کۆمەڵگای موسڵمانی تورکیادا، بەم کردەوەیەشی ئەوەندەی تر موسڵمانانی تورە کرد.

١٦- خەڵکی ناچار کرد کە بەزمانی تورکی بانگ بدەن و قورئان بخوێنن، بەیانییەکیان بە زمانی عەرەبی گوێی لە دەنگی بانگ دەبێت! دەست بەجێ فەرمانی ڕوخاندنی منارەی مزگەوتەکەی دەرکرد.!؟

١٧- ڕۆژمێری کۆچی قەدەغە کردو لەبەرامبەردا ڕۆژمێری (جریجوری) ڕۆژئاوایی هێنایە پێشەوە.

١٨- هەردوو چەژنی ڕەمەزانی پیرۆز و قوربانی پیرۆزی لابردن؟!.

١٩- لە بری ڕۆژی هەینی ڕۆژی یەکشەممەی کردە پشوی فەرمی دەوڵەت.

٢٠- حەج کردنیماڵی خوای قەدەغە کرد؟!.

٢١- بالاّ پۆشی ئافرەتانی قەدەغە کرد.[٧٤]

بەکورتی ئەتا تورك بەشێوەیەك فەرمان ڕەوایی تورکیای دەکرد،وەك ئەوەی کەس لەو ولاّتەدا نەبێت.

بەڵگەشمان لەم بارەوە وتەیەکی خۆیەتی کە دەڵێت: من تورکیام؟! تورکیاش منە! من بۆ تورکیا! وەك سییەکانی وەهام کە بەهۆیانەوە هەوا هەڵدەمژێت؟ هەر هەوڵێك کە بۆ لەناوبردنی من بدرێت، هەوڵە بەئاڕاستەی لەناو بردنی تورکیا.؟![٧٥]

---

[٧٤]- بڕوانە: (ارمسترنج،ص٢٢٧).

[٧٥]- بڕوانە: (حوار فی انقرة،ص٥٨).

بەڵێ ئەتا تورکی نەفرین لێ کراو بەو شێوازە فەرمان ڕەوایی تورکیای کردو سەرئەنجام بۆ ماوەیەکی کاتی توانی ئاینی ئیسلام لەسەر خاکی تورکیا سەرکوت بکات!؟ ئەو ئیسلامەی کە پێنج سەد ساڵ بوو ڕەگی لەناو هەست و سۆزی خەڵکی ئەو وڵاتەدا داکوتا بوو، لەماوەی حوکمی ڕەشیدا تورکیای گێڕایەوە بۆ قۆناغە بەردینەکان و، لەهەموو جومگەکانی ژیاندا بەندەکانی خودای بە بەندەی خۆی کردبون، ئەمەش پاش ئەوە دێت ئەو وڵاتە عەیامێك بوو پایتەختی وڵاتی موسڵمانان بوو.

# ژیانی تایبەتی کەمال ئەتاتورك

مستەفا کەمال کەسێکی ئارەزو باز بوەو تەنانەت ئەمە گەورەترین ناونیشانی ژیانی تایبەتی ئەتا تورکەو بەمە دەناسرێتەوە، دەتوانین ژیانی لە سێ وشەدا کورت بکەینەوە: ئافرەت، شەراب، خۆبەگەورەزانین.

١-ئەتا تورك لەکاتێکدا تەمەنی تەنها چواردە ساڵان بووە، لەگەڵ کچە دراوسێیەکیاندا زینای کردوە.!؟

٢-بەهەرکوێیەکدا تێ پەڕ ببوایە، ئەگەر یانەو باڕو شوێنی خواردن و ڕابواردنی تیادا بوایە،ڕوی تێ دەکرد،لە دیمەشقدا ئەمە پیشەی ئەتا تورك بوو، لە شاری سلانیکیش هەموو جارێك بینراوە کە سەردانی یانەکانی (أولیمبوس، بالاس، یونیو کریستال) ی کردوە.

ئەو کاتەی لە صوفیای پایتەختی ڕۆمانیا بوو، لە شوێنەکەیاندا پاشکۆیەکی سەربازی تایبەت بە خواردنەوەو ڕابواردن و داوێن پیسی تیادا بوو، ئەتا تورك هەتا ڕۆژ دەبویەوە لەوێداو لەگەڵ ئافرەتە داوێن پیسەکاندا ڕای دەبوارد، هەروەك لە حەلەب و ئەنکەرە (خالدە أدیب)ی

داوێن پیس لەگەڵ مێردەکەی لەلای خۆی جێگە تایبەتی دانابوو بۆیان، کەبەردەوام ئەو شوێنە جێگای یەکتر بینین و ڕابواردنیان بوو..[76]

٣- فەلسەفەی بەردەوامی ئەو بەسەر تاك و کۆمەڵ دا،ئەوە بوو بەردەوام داوای دەکرد کە دەست لە ڕابواردن و مەستی هەڵنەگرن،هەتا ئەو ساتە خۆشانەتان لەکیس نەچێت.[77]

٤-لەبەر زۆر خواردنەوەی مەی، دەمارەکانی پێڵووی چاوی سوور ببون، دەموچاویشی وەك تەماتە سوور بووبوو.

پاش ئەوەی وەك سەرۆك کۆماریش دەست بەکار بووە،ناوبراو هەر لەسەر کاری بەد ڕەوشتی بەردەوام بوو لەگەڵ ئافرەتان و مێرد منداڵاندا، لەجاران زیاتریش خۆی سەرخۆش دەکرد.؟!هەروەك هاوڕێیەکی "ڕەزا نوری" دەڵێت: ئەتا تورك دوچاری نەخۆشی سیل بوو، فەرمانی بە لابردنی بەربەستی دەلاقەکەی کرد، هەتا خەڵکی ببینن کە خەریکی مەی خواردنەوەیە.[78]

٥-ناوبراو چەندین دەویتی هەبووە،کە کاریان پەیدا کردنی ئافرەت بووە بۆ ئەتا تورك،لەو کەسانەش کاری دەویتی یان بۆ ئەنجام داوە، وەك: جەواد عەباس، هەروەها تۆفیق ڕوشدی وەزیری دەرەوەی تورکیا، ئەو لە ئەنکەرەدا خانویەکی تایبەتی بۆ کاری بەدڕەوشتی ئەتا تورك تەرخان کردبوو.

لە گرنگترین ئەو ئافرەتانەی کە دۆستی ئەتا تورك بون و کاری بەد ڕەوشتییان لەگەڵ ئەنجام داوە،وەك: (صالحة) کە لەلایەن هاوسەرەکەیەوە

---

[76]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص١٩٢).

[77]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص٢٠٠).

[78]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص٣٨٠).

پێشکەشی کراوە،هەروەها (فکریة) ش یەکێکی تر بووە لە دۆستەکانی، هەمان کات (أفة) بۆ ماوەی چواردە ساڵ و بەبێ دابڕان خەریکی خۆشەویستی و بەد ڕەوشتی بووە لەگەڵیدا،لەبەر ئەمەش نازناوی دۆستە بەردەوامەکەی لێ نرا، هەروەها کچە بولغارییەکی جوانیشی پێ بەخشرا لەلایەن هاوسەرەکەی (لطفی) پارێزەرەوە، پێشکەش کردنی ئەم کچە بۆ چەند دەسکەوتێکی مادی دەگەڕایەوە کە هاوسەرەکەی (لطفی) لە پڕۆژەی (بارون) دا دەستی کەوتبوو،هەروەك موفید بەگیش کچێکی خۆی پێشکەشی ئەتا تورك کرد،هەمان کات خەلیل پاشا هاوسەرەکەی خۆی پێشکەشی ئەتا تورك کرد، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ دەسکەوتەکانی لەبواری نەوتدا، لە بەرامبەردا ئەتا تورك سی هەزار لیرەی پێ بەخشی.[79]

٦- کۆمەڵە ئافرەتێکی داوێن پیسی هێنایە کۆشکەکەیەوە، وەك کارەکەری هەمیشەیی کاریان دەکرد ناوی (کچانی خۆی) لێنابون.

بە داخەوە لە ئێستاشدا هەندێك بەناو شۆڕش گێڕ لاسایی ئەتا تورك دەکەنەوە، ئەویش بە کۆکردنەوەی ئافرەتان لە کۆشکە کۆماریەکانیاندا کە بە (شۆڕش) ناو دەبرێن.

ئەگەر بمانەوێت لەسەر ئەم لایەنە تایبەتەی ئەتا تورك پێداچونەوەی زیاتر بکەین ئەوە کاتێکی زۆرولاپەڕەی زیاتری دەوێت،بە کورتی ئافرەت و مەی خواردنەوە، ئەتا تورکیان دوچاری چەندین نەخۆشی کرد،تا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جەستەی سست ولاوازتر دەبوو.

---

[79]- بڕوانە: (الرجل الصنم،ص٣٩٤).

# نەخۆشكەوتن و مردنی ئەتـاتورك

مـستەفا كـەمال دووچـاری نەخۆشـی جگـەر بـوو؟ ئەمـەش بـەهۆی ئـەو كحولـەوە بـووە كـە لـە (مـەی) شـەراب دا هەیـە، نەخۆشیەكەی بـە شـێوەیەك بوو،كـە بـە بـەردەوامی ئـاو لـەناو سـكیدا كـۆ دەبوویـەوە ئـەم نەخۆشـیە بەشێوەیەكی زۆر خێرا ئەتا توركی بێـزار كـرد، بـە تـەواوی زاكیرەی لاواز بوو،سـەرئەنجام و بـە بـەردەوامی لـە لوتیـەوە خـوێنی لێ دەڕۆشـت و دواتـر دووچـاری نەخۆشـیە جنـسیەكان بـوو، هـەروەك بـەردەوام نێـوانی ڕانـەكانی دەخوراند.

لە ناو جگەریدا ئاو كۆ دەبوویەوە، بە سرنج دەریان دەهێنـا، سـەرئەنجام سكی دەبەی كرد و قاچەكانی ئاوسان.

ئـەتا تـورك نەخۆشـیەكەی زۆری بـۆ هێنـاو ڕۆژلـە دوای ڕۆژ لاوازتـری دەكرد،خوێنی بەردەوام كەمی دەكرد و ناوچـەوانی زەرد هەڵگـەڕا،تا وای لێ هات لە جوڵە كەوت.

لـەكاتی مردنیـدا ئـەتا تـورك، نـاردی بەشـوێن (لـورین)ی بـاڵیۆزی بەریتانیـدا،داوای لێ كـرد كـە پـاش خـۆی سـەرۆكایەتی كۆمـاری توركیالـە ئەستۆ بگرێت.؟ بەڵام ناوبراو داواكاریەكەی ڕەت كردەوە.؟!

توركـەكان زۆر بـە سەرسـوڕمانی بـاس لـەو ئازارانـە دەكـەن كـە مـستەفا كەمال لەكاتی نەخۆشیەكەیدا دوچاری بووە.؟

وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ الـسجده: ٢١. واتـە: دەبێـت لـە دونیـا

سزایان پێ بچێژین، پێش سزا گەورەکەی ڕۆژی قیامەت، بەشکوم بگەڕێنەوە لە لادان و لە کوفر.[80]

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِيٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾ فصلت: ١٦. واتە: جا ئێمەش بایەکی توندی بە دەنگمان نارده سەریان، هەر بە شریخەو دەنگەکەی زۆربەیان مردن لە چەند ڕۆژێکی توش و شومدا، تا هەر لەم ژیانی دونیایەدا ژیانێکی ئابڕوبەرانەیان پێ بچێژین، بێ گومان سزای پاشە ڕۆژیش سەخت ترو ئابڕو بەرترەو، یارمەتیش نادرێن بۆ ڕزگار بونیان.[81]

مستەفا کەمال لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا بە دەنگێکی بەرز هاواری دەکرد،لە کۆشکی (دولمە باغچە) کە تیایدا دەمایەوە لە قوستەنتینیە، هاوار کردنەکەی دەچوە دەرەوەی کۆشك.![82]

نەخۆشیەکە تەواو ئەتا تورکی بێزار کرد،تا ئەو ئەندازەیەی کێشی لەشی کەمی کرد بۆ (٤٨) کیلۆ، تاقمی ددانەکانیشی کەوتن، ئەندازەی دەمی گەیشتبویە گوێکانی ،داوای کرد کە پاش مردنی نوێژی مردوی لەسەر نەکرێت، سەرئەنجام لە ڕۆژی پێنج شەممەی "١٠ ی نۆڤەمبەری ١٩٣٨" و لە کاتژمێر، نۆ و پێنج خولەکی بەیانی ئەتا تورکی "نەفرین لێ کراو لە ئاسمان و زەوی" کۆچی دوایی کرد، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴾ الدخان: ٢٩.

---

[80]- تەفسیری ڕامان.

[81]- تەفسیری ڕامان.

[82]- بڕوانە: (الرجل الصنم، ص٥١٩).

واتـه: جـا ئاسمـان و زەوی شـین و زاری نـەکردن، وە سـاتێکیش مۆڵـەت نەدران و دوا نەخران بۆ کاتێکی تر، بەڵکو بە پەلە سزا دران.[83]

بـەڵێ ئـەتا تـورك بـەو شـێوازە دونیـای بـەجێ هێـشت،پاش ئـەوەی کـە خەلافەتی ڕمانـدو تورکیای وێران کرد،شیرازەی خێزانـی هەڵوەشاندەوەو، بـەد ڕەوشـتی بـڵاو کـردەوەو دروشـم و بـەها جوانـەکانی لـەناو بـردو مزگەوتەکانی پەروەردگاری کردن بە گەنجینەی داو و دەرمان هەڵگرتن.

هــەروەها خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ ۖ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ الأنعام: ٩٣، ٩٤. واتە: دەبێت چ کەسێك لەوە ستەمکار تر بێت و بڵێت:خوا هیچ شتێکی بە وەحی نەناردوەتە خواری،نە تـەورات و نـە قورئـان! یـان بڵێـت: مـن لەلایـەن خـواوە وەحـی و سروشـتم بـۆ کراوە،لـە

---

[83]– (سەعیدی کوڕی جوبەیر) دەڵێ: پیاوێك لە (ئیبن عەباس)ی پرسی: مانای ئایەتی (فما بكت عليهم السماء والأرض ) چییە؟ دەبۆ ئاسمان و زەویی بۆ کەس دەگرین؟ وتی: بەڵێ چونکە هەموو کەسێ لەئاسماندا دەرگایەکی خۆی هەیە، لەو دەرگاوە رزق و نیعمەتی بۆ دێ. هەر لەوێشەوە کارو کردەوەکانی بەرز دەبنەوە، جا کاتێ مرد ئەو دەرگایەی دادەخرێ و ئیتر ئەویش بۆی دەگری! وە هەرکات لەو جێگایە بڕا کە لەزەوییدا سوژدەی تێدا بردووە ئیتر زەویش یادی دەکاو بۆی دەگری! بەڵام قەوم و هۆزەکەی فیرعەون، چونکە سوژدەیان نەبردو کردەوەی چاکیان نەبوو، ئاسمان و زەوی نەگریاو بۆیان بەداخ نەبوو. تەفسیری ڕامان. ل٤٩٧.

ڕاستیشدا هیچ شتێکی بۆ وەحی نەکراوە، وەیان بڵێت: منیش دەتوانم وەك ئەو کتێبانە بنێرم، کە خوا ناردونی! ئەگەر لەو کاتەدا کە ستەم کاران لە ناڕەحەتی و پەلەقاژەی مەرگدان ببینی، چۆن گرفتارن، فریشتەی گیان کێشانیش دەستیان لێ دەکەنەوەو لێیان دەدەن و پێیان دەڵێن: دە گیانی خۆتان لە جەستەتان دەربهێنن و بینێرنە لای قاڕو تورەیی خوای گەورە، بێ گومان ئەوانیش بۆیان دەرنایەو فریشتەکانیش لە پشتەوە تێیان دەسرەوێنن و پێشیان دەڵێن: وا ئەمڕۆش بە ئەوپەڕی سەر شۆڕی و ڕیسواییەوە جەزرەبەو تۆڵە دەدرێن؟ چونکە لە دونیادا لەسەر خوا درۆتان هەڵدەبەست و قسەی نا بەجێتان دەکرد،لە بەرامبەر ئایەتەکانیشیەوە خۆتان بە زل دەزانی،لە ڕۆژی دواییدا خوا بە بێ باوەڕەکان دەفەرموێت: وا ئەمڕۆ بێ ماڵ و حاڵ و ڕوت و قوت و تاك و تەنیاو بێ سۆ هاتنەوە لامان، هەروەك چۆن لە سەرەتاوە بێ ماڵ و حاڵ و ڕوت و قوت دروستمان کردن! هەرچیشمان پێ دابون لە ماڵ و سامانی دونیا،لە دوای خۆتان گشتتان جێ هێشت، ئەوانەش نابینن بە هاناتانەوە بێن کە پێتان وەها بوو شەریك و هاوبەشی خوان، هەتا تکاو شەفاعەتتان بۆ بکەن،ئەوا هەرچی ئەسباب و هۆی پەیوەندی نێوانتان بوو پچڕاو نەما، ئەو شتانەش ئێوە بە خەیاڵ واتان دەزانی تکاتان بۆ دەکەن،هەموو تیا چون و بەهیچ دەرچون.[٨٤]

عیرفان ئۆرکا دەڵێت: ئەتا تورك بۆچونی وەهابوو کە ئەبێت هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوام دژ بە ئاین بێت،هەر لە منداڵیەوە بڕوای وەها بوو کە مرۆڤ پێویستی بە خوا نیە!هەروەك خۆی لەو بارەوە دەڵێت: هێزی مێشك و ویستی مرۆڤ دەتوانن زاڵ بن بەسەر هێزو ویستی خوادا،ئەتا تورك لە دوا

[٨٤]- تەفسیری ڕامان.

ساتەکانی ژیانیدا دەستی بەرز کردەوەو بەرەو ئاسمان ڕای دەوەشاند،وەك هێمای هەڕەشە کردن و گاڵتە جاڕی.[85]

# تورکیای پاش ئەتا تورك

١-ئـەتاتورك مـرد، پـاش ئـەوەی کـە تورکیـای ڕووبـەڕووی برسـیەتی کـردەوە، کارەکانیـشی بـە دڵـی ڕۆژ ئـاواو جێگـای خۆشـحاڵی ئـەوان بـوو، خاچپەرسـتان و جولەکـە زۆرپێـداگیر بـوون لـە پاراسـتنی دەسـتکەوتە ڕوخێنـەرەکانی ئـەو، بـێ گومـان ئەگـەر لـەڕێی بـەکرێ گیراوێکـی وەك ئەتاتورکـەوە نەبوایـە بەخـەونیش ڕمـانی دەوڵـەتی ئیسلامییان نـەدەبینی؟ پـاش ئـەتا تـورك عیـسمەت ئینـو نـو بـوو بـە سـەرۆك کۆمـاری تورکیا،ئـەو نـەفرین لێکـراوە لـە سـاڵی "١٩٤٨" دا دانـی نـا بـە دەوڵەتەکـەی قـەوارەی زایۆنیدا،پاشان ئەمریکاش بنکە سەربازیەکانی خۆی تیادا بڵاو کردەوە.

٢-ڕۆژئاوا دەیویست ئەزموونی ئەتا تورك لەناو گەلی تورکیـادا دووبارە بکاتـەوە، پاشـان عیسمەت ئینـو نویـان ناچـار کـرد ڕێگـە بەدروسـت بـونی پـارتی سیاسـی بـدات لـە تورکیـادا،دواتر ئینـو نـو (جـەلال بایـار) ی دەستنیشان کردو داوای لێ کرد پارتێکی بەرهەڵست وپـارتێکی دیمـوکراتی پێك بهێنێت ، جەلال بایاریش هاوکاری عەدنان مەندەریسی دەکرد، پاشان (عەدنان) بوو بە باڵی سەرەکی گاڕگێڕ لەناو پارتەکەدا.

٣-خـوای پـەروەردگار ویـستی وەهـا بـوو لـەو ماوەیـەدا ڕوداوێکـی زۆر سەرسوڕ هێنەر لە ژیانی مەندەریسدا ڕوبدات،جارێکیان مەندەریس سواری فڕۆکـە دەبێـت و پـاش ماوەیـەك لـە فڕینی،یـەکێ لـە بزوێنـەرەکانی

[85]- بڕوانە: (الاصلاح بين الفكرة الاسلامية والفكرة الغربية، للندوی،ص٥٢-٥٦).

دەوستێت؟! پاشان فڕکەوان لە مەترسی کەوتنە خوارەوە ئاگاداریان دەکاتەوە، لەو کاتەدا مەندەریس بەدڵێکی پەشیمانەوە ڕوو دەکاتە پەروەردگاری و دەڵێت: خوایە گیان ئەگەر لەم کارەساتە ڕزگارم بکەیت، بەڵێنی گەڕانەوەی ئیسلامت پێ دەدەم بۆ تورکیا؟! سەرئەنجام فڕۆکەکە کەوتە خوارەوەو تەنها کەسێکیش کە بە سەلامەتی لەمردن ڕزگاری بوو، عەدنان مەندەریس بوو؟!!.

٤- لە ساڵی "١٩٥٠" پارتی دیموکرات بە بەرنامەیەکی زۆر وردو بابەتیانە چوە هەڵبژاردنەوە،هەمان کات هەموو توێژینەوە ئەمریکیەکان پێشبینی شکستێکی زۆر گەورەیان بۆ دەکرد.

پڕوپاگەندەکانی هەڵبژاردنی پارتی دیموکرات لەم دروشمانە زیاتر نەبوون: گەڕاندنەوەی بانگ دان بە زمانی عەرەبی،ڕێگە دان بە تورکەکان بۆ ئەوەی حەجی ماڵی خوا بکەن، کردنەوەی قوتابخانە ئیسلامیەکان و وتنەوەی وانەی ئیسلامی تیایاندا، هەروەها لە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردندا بەڵێنی گەڕاندنەوەو کردنەوەی مزگەوتی (أیاصوفیا) یدا، وەك چۆن بە درێژایی پێنج سەدە مزگەوت بوو![٨٦]،هەڵوەشاندنەوەی دەست وەردانی دەوڵەت لە جل و بەرگی ئافرەتاندا، بێ گومان ئەگەر پێشکەوتن نەیەوێت بالاّ پۆشی بەسەر ئافرەتاندا بسەپێنێت،بە دڵنیاییەوە لەپێشکەوتن ناوەشێتەوە کە خۆ ڕووت کردنەوە بەسەر ئافرەتاندا بسەپێنێت.؟!

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین عەدنان مەندەریس زۆر ڕاستگۆ بوو لە گەڕانەوەیدا بەرەو ئیسلام، پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت کە بەردەوامی دان بە ڕێچکەکەی ئەتا تورك و جێگرەکەی تورکیا بەرەو وێران بونی زیاتر

---

[٨٦] - بڕوانە: (کشك، ص٥٩-٦٠).

دەبات،هەر لەبەر ئەوەش بوو گەڕانەوە بۆ ئیسلامی کردە بەرنامەی کارو بانگەشەی هەڵبژاردنەکەی؟چونکە ئەو لەوە تێگەیشت کە تەنها گەڕانەوە بۆ ئیسلام، دەبێتە هێزێکی بنەڕەتی گەلی موسڵمانی تورکیا بە ئاڕاستەی دەرباز بونیان لە قەیرانەکان.[٨٧]

٥- ئەنجامی هەڵبژاردنەکان زۆر سەرسوڕ هێنەر بوو،بۆ موسڵمانان سەرکەوتن و بۆ دوژمنانی ئیسلامیش ئەنجامەکە گاڵتەجاڕی و پێکەنیناوی بوو، پارتەکەی ئەتا تورك دوچاری شکستێکی مەزن بویەوەو تەنها سی و دوو کورسی پەرلەمانی بەدەست مایەوە، لەبەرامبەردا پارتی دیموکراتی سێ سەدو هەژدە کورسی بەدەست هێنا،جولەکەو ماسۆنیەکان دوچاری سەرسامبونێکی زۆر هاتن، کاتێك بینییان مەندەریس شکستی بە جێگرەکەی ئەتا تورك هێنا،لەو ڕۆژەدا ئینو نو هاواری کرد: عەدنان مەندەریس بە بانگەشەی ئاینی سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

دواتر عەدنان مەندەریس بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جەلال بایاریش وەك سەرۆك کۆمار دەست بەکار بوو،پاشان دەستی کرد بە جێ بەجێ کردنی ئەو بەڵێنانەی کە لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکاندا بە گەلی تورکیای دابوو.[٨٨]

بێ گومان مەندەریسی ڕاستگۆ وەلآمی گەلی موسڵمانی تورکیای دایەوە، یەکەمین دانیشتنی پەرلەمان کەوتە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەوە؟! لەو مانگە پڕ فەڕەدا گەورەترین دیاری پێشکەشی گەلی موسڵمانی تورکیا کرد، کە بریتی بوولە: بانگدان بە زمانی عەرەبی وئازادی لە پۆشینی جل و

---

[٨٧] - بڕوانە: (الافعی الیهودیة، ص٩٧-٩٩).

[٨٨] - بڕوانە: (الافعی الیهودیة،ص٩٩).

بەگداو،ئازاد کردنی وتنەوەی وانە ئیسلامیەکان،ئیدی لێرەوە دەستی کرد بە نوێکردنەوەی مزگەوتەکان.

بەتێپەڕ بونی ڕۆژگار، کاتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی "١٩٥٤" یش هاتە پێشەوە،ژمارەی کورسیەکانی پارتەکەی ئەتا تورك بۆ بیست و چوار کورسی دابەزی،ئیدی لێرەوە دوبارە ڕێگە درا بە فێربونی زمانی عەرەبی و خوێندنەوەی قورئان و وتنەوەی لە هەموو قوتابخانە بنەڕەتی و ناوەندیەکانداو، لەو میانەدا دە هەزار مزگەوتی دروست کرد،تەنها لە ئەنادوڵدا بیست و دوو پەیمانگای تایبەت بە پێگەیاندنی وتاربێژو مامۆستای ئاینی ئیسلامی کرانەوە،دواتر چاپ کردن و بلاْوکردنەوەی ئەو کتێبانە ئازاد کرا کە داوای پەیوەست بونی موسڵمانان دەکەن بە ئیسلامەوەو..هەموو ئەو مزگەوتانەیش کە ئەتا تورك کردبونی بە گەنجینە، نوێ کرانەوەو ڕۆڵە سەرەکیەکەی خۆیانیان بۆ گەڕایەوەو کرانەوە بە شوێنی پەرەستنی  خوای گەورە.

هەروەها مەندەریس لە بۆ دژایەتی کردنی قەوارەی زایۆنی لە عەرەب نزیك بویەوە، چاودێری توند خرایە سەر هەموو ئەو داوو دەرمانانەی کە قەوارەی زایۆنی دروستی دەکردن، هەمان کات لە ساڵی (١٩٥٦) دا باڵیۆزی قەوارەکەی لە تورکیا وەدەر نا،ئەوەی زۆر دڵخۆشکەر بوو، کردنەوەی سی و پێنج هەزار قوتابخانەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بوو.؟!

٦-سەرئەنجام جولەکەی جیهانی کەوتنە دژایەتی کردنی مەندەریس، بەتایبەت ڕۆژنامەنوسی بە ناوبانگی جولەکە (احمد امین یالمان)، خاوەن ئمتیازی ڕۆژنامەی (الوطن)، زۆر بە توندی دژایەتی مەندەریسی دەکرد، هەمان کات ئەمریکاو دەوڵەتانی تری ڕۆژئاوای ماسۆنی لەناو سوپادا کەوتنە جم و جوڵ، سەرئەنجام ژەنەڕاڵێکی ماسۆنی کە ناوی (جمال

جورسل) بوو،له سالّی "١٩٦٠"دا کوّدەتای سەربازی ئەنجامدا، هەریەکە لە مەندەریس و،فطین زور لو و،حسن بلکاثانیی، لە سێدارە دان.؟؟!![89]

لەم بارەوە سامی کوهینی ڕۆژنامەنوسی جولەکە دەڵێت: هۆکاری سەرەکی لە سێدارەدانی مەندەریس، نزیك بونەوەی بوو لە جیهانی ئیسلامی، هەمان کات بە پلە بەندی پەیوەندیەکانی تورکیای لەگەڵ ئیسرائیل دا داخست، پاشان پارتی عەدالەی شکست پێ هێنا.

٧-لە سالّی "١٩٦٥" دا هەڵبژاردن ئەنجام درایەوە،سەرئەنجام پارتی عەدالە سەرکەوتنی بەدەست هێنا،سەرۆکی پارتەکە سلێمان دیمیریل بوو،لەم بارەوە ئینو نو دەڵێت: من بە دیمیریل نەدۆڕام...بەڵکو ئەوە کۆمەڵەی نوری شوێن کەوتەی شێخ سەعیدی نەورەسی بوون دوچاری شکستیان کردم.

سەرئەنجام پارتی عەدالە لە کۆی چوارسەدو پەنجا کورسی توانی سێ سەدو شەست و سێ کورسی پەرلەمان بەدەست بهێنێت، دیمیریل قوتابخانەکانی ئەئیممەی بۆ حەفتاو دوو قوتابخانە زیاد کرد، هەمان کات قوتابخانەکانی تایبەت بە لەبەر کردنی قورئانی پیرۆزیشی زیاد کرد بۆ دوانزە هەزار قوتابخانەو،لە عەرەبەکانیش نزیك بوویەوە،هەروەها پەیوەندیەکانی لەگەڵ قەوارەی زایۆنیدا خاوبوونەوەی بە خۆیەوە بینی،پاشان پارتی عەدالە بەشداری خۆپیشاندانێکیان کرد دژ بە قەوارەی زایۆنی کە لە شاری ڕیبات ئەنجام درا،ئیدی لێرەوە ئەمریکاو جولەکەی جیهانی کەوتنە جولآندنی سوپا،سەرئەنجام سوپا کوّدەتای بەسەر پارتی

---

[89]- بڕوانە: (حسون،ص٢٩٨).

عەدالەدا ئەنجام داو دیمیریل لە کورسی فەرمان ڕەوایی دوور خرایەوە، بەڵام بە هۆی ماسۆنی بونیەوە، دیمیریل لە سێدارە نەدرا.

٨-ڕۆژ لە دوای ڕۆژ قەرزە کەڵەکە بوەکانی سەر تورکیا زیاتر دەبوون، ڕێژەی فراوانبوون لە ساڵی "١٩٧٠" دا گەیشتە (٪٤٢-٪٦٠) و ڕێژەی بێکاریش لە (٪٢٠) ی تێپەڕاند،قەرزەکانی تورکیا لە ساڵی "١٩٧٠"دا گەیشتە بیست و یەك ملیار دۆلار و لە ساڵی "١٩٧٩" شدا بۆ (٧١)ملیار دۆلار بەرز بونەوە.

بەو شێوازە حکومەتی تورکیا خۆی ڕادەستی بانکی نێو دەوڵەتی کردو نرخی لیرەی تورکی هەشت جار دابەزی، لە ساڵی "١٩٨٠" دا ڕێژەی ڕیبا (سو) بۆ لە (٪٣٠) بەرز بویەو،کە ئەمەش بەرزترین ئاست بوو لە جیهاندا.[٩٠]

٩-لە ساڵی "١٩٧٢" دا بەسەرۆکایەتی دکتۆر نەجمەدین ئەربەکان پارتی ئاشتی نیشتمانی هاتە کۆڕی تێکۆشان، دکتۆر نەجمەدین هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرای زانکۆی ئاڵمان بوو،پارتی ئاشتی نیشتیمانی لە ناو جەماوەردا پێشوازی باشی لێ کراو بەشێوەیەك زۆرێك لە لاوانی تورکیا چونە ڕیزەکانیەوە، ئەم پارتە زۆر دژایەتی ڕۆژئاواو ئەمریکای دەکرد،داوای لە تورکیا کرد کە لە (حلف الاطلسي) بێتە دەرەوەو هەمان کات داوای ئازاد کردنی تورکیای دەکرد، لە سەرجەم ئەو بنکە سەربازیانەی ئەمریکا کە لە وڵاتدا جێگیری کردبوون، ئەمە سەرباری ئەوەی زۆر بەتوندی ڕوو بە ڕووی قەوارەی زایۆنیش دەبویەوە، هەروەها دژی چوونی تورکیا بوو بۆ ڕیزی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا،هەمان کات

---

[٩٠]- بڕوانە: (ڕۆژنامەی الشرق الاوسط،١٩٧٩/٧/١٠، ڕۆژنامەی الامان،١٩٨٠/٧/١١، ڕۆژنامەی المجتمع، ژمارە: ٤٧٤).

داوای ناردنی سوپای تورکیای کرد بۆ هاوکاری کردنی موجاهیدانی ئەڤغانستان،هاوشێوەی ناردنی سوپا بۆ هاوکاری کردنی ئەمریکا لە جەنگی دژە کۆریادا.

١٠-وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا،پارتی ئاشتی لە سالی "١٩٧٢" دا دامەزراو لەماوەی هەمان سالدا،هەلبژاردن ئەنجام درا،سەرئەنجام پارتەکە سەرکەوتنی بەدەست هێناو توانی چل و هەشت کورسی پەرلەمانی بەدەست بهێنیت،پاشان لەگەل پارتی گەلدا حکومەتیان پێك هێنا، کە ئەجاوید سەرۆکایەتی دەکرد، نەجمەدین ئەربەکان چەند مەرجێکی پێشوەختەی بۆ بەشداری کردن لە حکومەتدا دانا،لەوانەش داوای پێدانی هەشت وەزارەتی کرد،ئەمە جگە لەوەی داوای پۆستی جێگری ئەنجومەنی وەزیرانیشی کرد.

پاش پێکهێنانی حکومەت، پارتی ئاشتی دەستی کرد بە پەروەردەکردنەوەی تورکەکان لەسەر ئاینی ئیسلام، پاشان دەرگای بۆ حەجی مالی خوا کردەوە و ژمارەی حاجیانی تورکیا سالانە دەگەیشتە سەدو پەنجا هەزار حاجی،ئەمەش شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو لە مێژووی ئەو ولاتەدا.؟!

١١-پارتەکەی نەجمەدین ئەربەکان "٣٠٠٠"بنکەی لەبەر کردنی قورئانی پیرۆزی لە گوندەکان کردەوە،هەروەك "٣٠٠"قوتابخانەی تایبەت بە پێگەیاندنی پێش نوێژو وتاربێژ کردەوە،هەمان کات نەخشەیەکی داڕشت بۆ دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامی بە ئاڕاستەی پێگەیاندن و پەروەردە کردنی پێش نوێژووتار بێژ،نزیکەی سەد هەزار قوتابی پەیوەندییان پێوەی کرد؟!، پێشتر ئەگەر فەرمانبەری دەولەت بە ئاشکرا نوێژی ئەنجام بدایە لەسەر کارەکەی لا دەبرا؟!!، بەلام بەهاوکاری خوای

گەورەو پاشان بە هەوڵی پارتی ئاشتی نیوەی فەرمانبەرانی دەوڵەت بە ئاشکرا نوێژیان ئەنجام دەدا، هەمان کات ئەم پارتە داوای کرد ڕۆژی هەینی بکرێتەوە بە پشوی فەرمی وڵات، هەروەك گرێبەستی هاوسەریەتی پەیوەست کردەوە بە ئاینی ئیسلامەوە و بەئازادیش لە قوتابخانەکاندا قورئان و زمانی عەرەبی دەوترانەوە.

١٢-پارتی ئاشتی کۆنترۆڵی یەکێتی گشتی قوتابیانی تورکیای کرد،ئەم یەکێتیەش نەوەدو شەش کۆمەڵەی قوتابیانی لەخۆی دەگرت،زیاتر لە سەدو سی و پێنج هەزار قوتابییان هەبوو،هەروەك لە یادی ئازاد کردنی شاری قوستەنتینیەدا ڕویان کردە مزگەوتی (أیا صوفیا) و نوێژیان تێدا ئەنجام دا،ئەو مزگەوتەی پێشتر ئەتا تورك کردبووی بە مۆزەخانە؟! هەروەك پارتی ئاشتی خاوەنی چاپخانەیەك و چادرگەی هاوینەی بەردەوام بوو،(احمد سازفیا) ی سەرۆکی یەکێتی گشتی قوتابیانی تورکیا دەڵێت: یەکەمین ئامانجی ڕێکخراوەکەمان ڕزگار کردنی مرۆڤی تورکیە لە نەفامی.

هەروەها پارتی ئاشتی خاوەنی دوو ڕۆژنامەی ڕۆژانە بوو،یەکەمیان ڕۆژنامەی (ملی جازینا) بوو کە تیراژی ڕۆژانەی سەد هەزار دانە بوو،ڕۆژنامەی (الدور الجدید) تیراژی دەگەیشتە پانزە هەزار دانە لە ڕۆژێکدا.؟

هەمان کات ئەم گۆڤارانەیشی بڵاو دەکردەوە:

١-ئیسلام ٢- هجرت (المانیا) ٣- ماورا(أدیبه)٤- أدبیات٥- جل رستا (باقه الزهر)٦- اقتباس جمع الاخبار٧- سلام.

گرنگترین ئەو گۆڤارانەی کە دەوڵەتی تورکیا قەدەغەی کردن:

١- التوحید، ساڵی ١٩٧٩ قەدەغە کرا.

٢- الشورا، ساڵی ١٩٧٨ قەدەغە کرا.

٣- هجرت.

٤- گۆڤاری اكنجلا.

٥- گۆڤاری تبليغ.

٦- گۆڤاری اديم.

٧- گۆڤاری الحركه،السبيل.

گرنگترين ڕۆژنامەی قەدەغەكراوی ڕۆژانەش،وەك:

١- ڕۆژنامەی تربيه الفكريه.

٢- ڕۆژنامەی تربيه الاخلاقيه (الروحيه).

٣- ڕۆژنامەی تربيه بدنيه.

١٣-پارتی ئاشتی دروشمی (بۆ هەموو شارێك كارگەيەك) ی بەرز كردەوە، ئەمەشی بەكردار خستە بواری جێ بە جێ كردنەوەو سەد هەزار كارگەی ئامێرە گەورەكانی دامەزراند،تا ئەو ئەندازەيەی دەتوانرا بزوێنەری فڕۆكەی جامبۆ دروست بكرێت.

١٤- لە ڕۆژی "١٩٨٠/٩/٧" دا پارتی ئاشتی خۆپيشاندانێكی بە دروشمی ڕۆژی ڕزگاری قودس ڕێكخست،ئالأی قەوارەی زايۆنيان سوتاند و بەفەرمی داوای دروست كردنی دەوڵەتی ئيسلامی و گەڕاندنەوەی فەرمان ڕەوايی ئيسلامييان كرد،،ئيدی لێرەوە ئەمريكا كەوتە جوڵاندنی سوپای توركی و سەرئەنجام لە "١٩٨٠/٩/١٢" دا (كنعان ايفرين) كودەتايەكی ئەمريكيانەی ئەنجامدا.

لەم بارەوە ڕۆژنامەی ئەهرامی ميسری لە "١٩٨٠/٩/١٣" دا لێدوانێكی بەناوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمريكاوە بڵاو كردەوەو تيايدا هاتبوو: ويلايەتە يەكگرتوەكانی ئەمريكا بڕياری كودەتاكەيان پێش ئەنجامدانی دەركردوە.

هـەمان کـات چـەند بەرپرسـێکی ئـەمریکی نیگـەرانی خۆیـان نیشـاندا لـە ئەگـەری دروسـت بـونی حکومـەتێکی ئیـسلامی و دەرچـوون لـە ڕێـچکەو ڕێبـازی ئـەتا تـورکی کـەڕێڕەوێکی عـەلمانی بـوو، تورکیـای لـەو ڕێگەیـەوە بەڕێوە دەبرد، پاشان ستایشی (کنعان أیفرین) و هاوڕێکانی کراو هـەمان کات ئـەمریکا بڕی حەوت سـەدو سـێ ملیـۆن دۆلاری وەك دیاریبـە تورکیا بەخشی.

١٥-(کنعـان أیفـرین) نەجمـەدین ئەربـەکان و بەرپرسـانی دیکـە پـارتی ئاشتی دەستگیر کردن، پاشان سەردەمەکەی بە دانانی تاجە گوڵینە لەسـەر گۆڕەکـەی ئـەتاتورك دەسـت پـێ کـرد و پـەیمانی پابەنـد بـوونی بـە ڕێچکەکەیەوە دوپات کردەوە، (کنعان أیفرین) و حکومەتەکەی ئەو ساڵەیان "١٩٨١" بە ساڵی ئەتا تورك دانا.

١٦-(کنعان أیفرین) ی نەفرین لێ کراو بالاّ پۆشی و ڕیشی لـە زانکۆکـانی تورکیادا قەدەغە کرد.

١٧- لـە ڕۆژی "١٩٨١/٤/٢٤" دا نەجمـەدین ئەربـەکان و سـی لـە گـەورە بەرپرسـانی پارتەکـەی لـە بـەردەم دادگایـەکی عـورفی سـەربازیدا دادگـایی کران،داواکاری گشتی چەندین تۆمەتی خوێندەوە کە ئاڕاستەی نەجمـەدین ئەربەکان و پارتەکەی کرا بوون،ئەوانیش بریتی بوون لە:

أ- کـار کـردن بـۆ گـۆڕینی بنـەما (یاسـایی، کۆمەڵایـەتی، ئـابووری، ڕامیـاری) یـەکانی دەوڵـەت،دوبارە داڕشـتنەوەیان لـەژێر ڕۆشـنایی ئـاینی ئیسلام دا.

ب- دامەزرانـدنی چـەندین کۆمەڵـەو سـەندیکای تایبـەت بـە قوتابیـان و کاسـب کـاران و کرێکـاران و..بـە نهێنـی پەیوەسـت کردنیـان بـە خـودی

پارتەکەوە،بە ئامانجی کار کردن بۆ گەڕاندنەوەی فەرمان ڕەوایەتی ئیسلامی و کارکردن بەپێی ئیسلام لە تورکیادا.

ج- کۆڕ و کۆبوونەوە و دروشمەکانی پارتی ئاشتی نیشتیمانی، ڕوون کەرەوەی ئامانجەکانی ئەم پارتەن،لەو دروشمانەش (موحەممەد ڕابەرمانە)، (بتەکان تێك دەشکێنین و دەوڵەتی ئیسلامی دادەمەزرێنین)، لەو لافیتانەش کە پارتەکە بەرزی کردوونەتەوە ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾،المائدە: ٤٤، هەروەها ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ﴾ الإسراء: ٨١.

د-لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیاندا زۆر یادی خوایان کردووە؟! بەردەوام ئەوەیان بیری گەل ئەهێنایەوە،کە گەل بە درێژایی مێژوولە پێناو ئیسلام دەجەنگا نەك لە پێناو چەند سەرکردەو کەسانێکی دیاری کراودا.

ه-ئەربەکان لە حەجی ساڵی "١٩٧٧" دا لەشاری مەککە وتارێکی پێشکەش کرد،کە تیایدا هاتبوو: (لەسەرمان پێویستە گفتوگۆ لە بارەی ئەوە بکەین،ئایا دەمانەوێت قورئان لە سیستەمی فەرمان ڕەوایی دا جێ بە جێ بکەین، یاخود نا).

و-سوربون و پێداگری ئەربەکان لەسەر کردنەوەی قوتابخانەی لەبەر کردنی قورئان لە هەموو لادێکانداو، پێداگریشی لەسەر کردنەوەی مزگەوتی (أيا صوفيا) دەکرد.

ز-یەك لە دەرچوانی کۆلێژی شەریعەی زانکۆی ڕیاز،لە کۆبونەوەیەکی پارتی ئاشتی دا دەڵێت: خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم کە لەم کۆبونەوە ئیسلامیەدا بەشداریم کردوە.

ح- نوێنەری (کرم ملا أوغلو) لە وتارێکیدا کە لە سەربازگەی (جنة القلعة)، پێشکەشی کرد،تیایدا دەڵێت: شۆڕشەکانی ئەتا تورك گەلی تورکیای دابڕ کرد لە مێژووی ڕابردوی خۆیی و،چاکسازیەکانی ئەو بەها جوانەکانی گەلیان لەناو بردو، بەتوندی دابەزییە سەر ڕێکەوتننامەی لۆزانوکردنی پیتەکانی زمانی عەرەبی بە لاتینی وگۆڕینی یاساکانی ئیسلام و...، لە کۆتایی وتارەکەیدا گوتی: تورکیای ئێستا کۆمارێکی لادەر و خوا نەناسە.

ط-ئەربەکان لە یەك لە وتارەکانیدا ئەوەی ئاشکرا کردوەو دەڵێت: لە کاتێکدا بەشداری لە دەسەڵاتدا کردوە، زۆرێك لە فەرمانڕەوایانی هەرێمەکانی تورکیا فێری نوێژ بوون.

ی-پارتی ئاشتی داوای کرد ڕۆژی هەینی بکرێتە پشوی دەوڵەت و،گرێبەستی هاوسەریەتی بەپێی بنەما ئیسلامیەکان بێت.

ك-ئەربەکان دەڵێت: سەربەست بونی مرۆڤلە بەندایەتیدا،لە وڵاتانی ڕوسیاو ئاڵمان ڕێ پێدراوەو بۆ تورکیاش بەهەمان شێوەیە؟ چونکە بەندایەتیەکان هەموو ئاین ناگرنەوە.

ل-ماسۆنیەت تاوانبار دەکەن لە لادانی سوڵتان عبدالحمید دا،یەکەم ئەنجومەنی ماسۆنی کە هێرشی کردە سەر دەوڵەت لە سالۆنیك بوو،ئەتا تورك یەکێك بوو لەوانە،ئەمەش سوکایەتییەکی ئاشکرایە.

م-کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی کە لەناو بەری سوڵتان عبدالحمیدن، بە ماسۆنی و جولەکە تاوانبار دەکەن.

ن-لە نوسینگەکەی ئەربەکاندا دەست بەسەر کۆمەڵە نوسراوێکدا گیراوە، کە باس لەوە دەکەن چەندین گەورە بەرپرسی ئەستەنبوڵ

بەیعەتیان پێی داوە، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەربەکان پاڵێوراوی خەلافەتە.[٩١]

لە بەرامبەر تۆمەتە ئاراستە کراوەکاندا،جێگری گشتی داوای بەند کردنی ئەربەکان و هاورێکانی کرد بۆ ماوەی "١٤-٣٦" ساڵ.

سەرسوڕمانیت کۆتایی پێ نەیەت کەئەو تۆمەتانە ئاراستە دەکەیت لە کاتێکدا تۆ لەسەر خاکی موحەممەد فاتیح و سوڵتان عبدالحمید و ناوەندی خەلافەتیت، کە بەردەوام شورایەکی پتەوو منارەیەکی بەرزو کۆ کەرەوەی هەموو پێکهاتە جیاوزەکانی کۆمەڵگای موسڵمانان بوو،هەمان کات رێنمونی بوو بۆ ئەو کەسانەی نوری رێنمونی ئەم ئاینەیان دەگرتە بەر.

١٨-بە دڵنیاییەوە ڕۆژئاواییەکان و بەتایبەت ئەمریکا،پاش ئەوەی قازانجێکی زۆریان لە تورکیادا لەسەر دەستی ئەتا تورك دەست کەوت، نایانەوێت بە ئاسانی ئەو دەسکەوتانەیان لە کیس بچێت،لەبەر ئەوە موستەفا کەمالیان بۆ خەڵکی تورکیا وەك پەرەستراو لێ کرد،تا ئەو ئەندازەیەی دەبوو لەگەڵ ناوهێنانی ئەتا تورکدا بچەمێنەوەو دەست بە سنگیانەوە بگرن، ئەگەر پەنجا ساڵیش بەسەر مردنەکەیدا تێپەڕ بوو بێت، ئەمریکا و ڕۆژئاواییەکان ئەوەندەیان پیرۆز کرد، تا ئەو ئەندازەیەی دەست درێژی کردن بۆ سەر کەسایەتی ئەتا تورك بە تاوان ئەژمار دەکراو خاوەنەکەی بە توندی سزا ئەدرا، تەنانەت لە دەستوردا پیرۆزی ئەتا تورك خراوەتە پێش خواو پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)! بێگومان ئەمەش فڕو فێڵی مرۆڤە، بەڵام نەخشەسازی خوا بەهێزتر وبالاّ ترە،وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ

---

[٩١] - بڕوانە: (المجتمع،ژمارە "٥٣٠" ڕۆژی ١٩٨١/٥/٢٦).

رُوَيۡدَۢا ﴿١٧﴾ ﴾ الطارق: ١٥-١٧.واتە: بێ گومان ئەو بێ باوەڕانە فرت و فێڵ دەکەن، بۆ کوژاندنەوەی نوری قورئان،وە منیش بە نەخشەی حەق فێڵیان پووچەڵ ئەکەمەوە، جا تۆش ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، پەلە لە بێ باوەڕەکان مەکە، کەمێك مۆڵەتیان بدەو لێیان بوەستە.[٩٢]

١٩-گەلی تورکی بەدرێژایی مێژوو گەلێکی ئایندار بوون،ئیسلام ڕەگی قوڵی لەناویاندا داکوتیوە، جەستەیشی کە تووشی دوومەڵێك دەبێت وەك ئەتا تورك هیچ لە سروشتی ئەو گەلە ناگۆڕێت و،دۆستایەتی ئیسلام و تورکەکانی پێ تێك ناچێت،گەلی موسڵمانی تورکیا هیچ کات ئەوەیان لەبیر ناچێتەوە،کە بە درێژایی پێنج سەد ساڵ، ئاینی ئیسلام لە وڵاتەکەی ئەوانەوە فەرمان ڕەوایی ناوچەیەکی بەرفراوانی جیهانی کردوەو، تورکیا لەو ماوەیەدا پایتەختی ئیسلام و خەلافەتی ئیسلامی بووە،بە داخەوە دوبارە گەلی تورکیا دوچاری زەبونی کرایەوەو، بە دەستی مستەفا کەمال و عەلمانیەتەکەی، ماوەیەك کەوتە دواوەی کاروانی مرۆڤایەتیەوە،تا ئەو ئەندازەیەی قەرزەکانی تورکیا لە ساڵی "١٩٧٩" دا گەیشتنە حەڤدە ملیار دۆلار.؟!

٢٠- بە دڵنیاییەوە گەلی تورکی دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگارو دوبارە بە خۆشەویستییەکی تەواوەوە ئاینەکەیان لە ئامێز دەگرنەوە، هەرچەندە کات درێژەی هەبێت،لە تورکیای دوای ئەتا تورکدا سەدان هەزار لەم نەوە لاوەی ئێستا بەڕێوەن کە قورئانی پیرۆزیان لەبەرەو بە کەسانی دیکەشی دەڵێنەوە، ئەمەش یاسای خوایە کە خەڵکی لەسەر دروست کردوە: ﴿ فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ

[٩٢]- تەفسیری ڕامان.

لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

**الروم: ٣٠. واته: ئەی ئینسان!؟ زۆر بە پاکی و دروستی ڕوو لەم ئاینە پاك و بێگەردەی ئیسلام بکە،لەسەر ئەو خیلقەتە بن کە خوا خەڵکانی لەسەر دروست کردوەو پەیڕەوی ئاینی یەکتا پەرەستی بکەن،نابێت هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لە دروست کراوی خوادا بکرێت کە خەڵکی لەسەر دروست کردوە،هەر ئەوەیشە ئاینی ڕێك و ڕاست،بەلأم زۆربەی ئاپۆڕەی مەردوم هەقیقەتی ئەوە نازانن.[٩٣]**

# دەنگدانەوەی بزووتنەوەی ( کەمالی ) و ڕەنگدانەوەی لەسەر جیهانی ئیسلامی

**شتێکی ڕون و ئاشکرایە ئەتا تورك یەکێك بووە لە ئەندامانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی،کەسانێك پێشڕەوایەتی ئەو کۆمەڵەیان دەکرد نە موسڵمان بوون و نە تورك بون،نمونەی بەرپرسانی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی،وەك ئەنوەر پاشا خەڵکی پۆڵەندا بووە، هەروەها جاوید،یەکێك بووە لە جولەکەی دۆنمە،(کراسو) جولەکەیەکی ئیسپانی بووە،تەڵعەت پاشاش کەسێکی غەجەری، ئەحمەد ڕەزاش مەجەڕی بووە...هتد،سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی کەسانی ماسۆنی بوون.**

**بێ گومان ئەتا تورك پاش ڕێکەوتننامەی (لۆزان) هاتە سەر حوکم و جڵەوی فەرمان ڕەوایی تورکیای گرتە دەست،لە ڕێکەوتننامەکەدا (کرزون) ی ڕاوێژکاری دەرەوەی بەریتانی،مەرجی لەناوبردنی خەلافەتی ئیسلامی**

[٩٣]- تەفسیری ڕامان.

بەسەردا سەپاند، هەروەها داوای لێ کرد بە توندی ڕوو بە ڕووی هەر جۆرە هەوڵێك ببێتەوە کە بە ئاڕاستەی گەڕاندنەوەی خەلافەت بێت، هەروەك ڕاوێژکارەکەی بەریتانیا داوای لە ئەتا تورك کرد سەرجەم دروشمە ئیسلامیەکان لەناو ببات و یاسا ئیسلامیەکان وەلا بخات و بە یاسا ڕۆژئاواییەکان جێگەکەیان پڕ بکاتەوە،مستەفا کەمال ماوەی ساڵانی تەمەنی لە "١٩٢٢-١٩٣٨" تەرخان کرد بۆ جێ بە جێ کردنی ئەو پیلانە،بانگی بە زمانی عەرەبی قەدەغە کرد، پیتە عەرەبیەکانی لابردو پیتی لاتینی هێنایە پێشەوەو، بالاّ پۆشی ئافرەتانی قەدەغە کرد، مزگەوتی (أیا صوفیا) ی کرد بە مۆزەخانەو...

سەرئەنجام ئەتا تورك مردو پاش خۆی عیسمەت ئینو نوی جێگری درێژە پێدەری بەرنامەکەی بوو،پاش دەرکەوتنی پارتی ئاشتی ئیسلامی و بەستنی گۆنگرەی (قونیە) بە سەرۆکایەتی نەجمەدین ئەربەکان و،بە ئامادەبونی نزیکەی سەدو پەنجا هەزار کەس! ئیدی ئەمریکا ئەو ڕاستیەی بۆ دەرکەوت، کە کەمالیزم بەرەو پوکانەوە و لەناو چوون دەڕوات،پاشان پەنای بۆ ئەنجامدانی کۆدەتای سەربازی برد،ئەمریکا لەم ڕێگایەوە کەوتە دژایەتی کردنی تەوژمی ئیسلامی و،مەبەستی بوو بە ئاگرو ئاسن درێژە بدات بە کردەوە قێزەونەکانی مستەفا کەمال.

دواتر حکومەتی سەربازی،هەستا بە دروستکردنی پەیکەر کە بەوێنای کەمالیزم نەخشێنرابوو، بە هەموو شوێنێکدا بڵاو کرانەوە،لێرەدا بە کورتی ئەزمونی کەمالیزمتان بۆ دەخەینە ڕوو:

١-ئەم ئەزمونە بریتی بوو لەپەڕو باڵکردنی موسڵمانان لەلایەن خاچ پەرەستانەوە، پیلانەکەشیان لە ڕێی ئەتا تورکی داماوی ونبوو و شوێن کەوتەی ئارەزوو بازی و دونیا ویستییەوە جێ بەجێ کرا.

لەمبارەوە توینبی[94] دەڵێت: بە دڵنیاییەوە ئێمە تورکێکی موسڵمانی تەقلیدی بە پەرۆشمان ناوێت،لەگەڵ ئەوەی بۆمان دەڕوانی، توڕەیی و کینەی لێ بباریێت و لەبەر ئەوەی کە ئێمە کەسانێکی فەڕەنسی دوو ڕوو و بێ باوەڕین..هەوڵماندا کۆتایی بەو بڵندبوونەیان بهێنین، دواجار توانیمان ئەو چەکە دەروونیەیان بشکێنین،هانماندان بۆ بەرپا کردنی ئەو شۆڕشەی ئێستا لەبەرچاوماندایە.

ئێستا و پاش ئەوەی بە هاندان و چاودێریکردنمان گەلی تورکیامان گۆڕی،وای لێ هات تاکی تورکی بە شوێن هەموو هۆکارێك دەگەڕێت هەتا خۆی بگەیەنێتە ئاستی ئێمە یاخود ئاستی ڕۆژ ئاواییەك لە دەورو بەریدا، بەڵام لە ئێستادا ئێمە هەست بە خەم و ناخۆشی وکین و توڕەیی دەکەین،لە کاتێکدا تورکێك بڵێت: (ئێمە لە نزیکەوە فوومان بۆلێدان، بەڵام سەماو خۆشیمان نەنواندو، لە کاتێکدا ئێوە دووچاری ئازارو غەمیش بوون،ئێمە نەگریاین بۆتان)؟ ئەمە وتەی توینبییەو خوای گەورەش ڕاستی فەرمووە:

﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾الحشر: ١٦. واتە: نمونەی دوو ڕووەکان لە هەڵنانی جولەکەدا لە بۆ کوشتار لەگەڵ پێغەمبەرو موسڵماناندا،وەك نمونەی هەڵنانی شەیتان وەهایە بۆ کافر کردنی مرۆڤ،کاتێك پێی وت: کافربە! من لەگەڵتم،جا کاتێك بێ باوەڕ بوو گوتی: بەڕاستی من بەری و بێزارم لە تۆ،بەڕاستی من لە خوای پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم.[95]

---

[94]- بڕوانە: (الاسلام والغرب والمستقبل، لتوينبي، ص٥١-٥٢).

[95]- تەفسیری ڕامان.

هـــــەروەها دەفـــــەرموێت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ﴾ البقرة: ١٦٦. واتە: ئەو کاتەی کە سەرۆك و پێشەواکان لە پەیڕەوانی خۆیان بێزار دەبن و حاشا دەکەن،کە بە چاوی خۆیـان سـزاکە دەبینن!هـەموو پەیوەنـدی و هۆیـەکی نێوانیـان پـچڕاو لێك ترازا،وە بە خزم و کەس و کارو گرۆهەکانیان هیچ هیوایەك نەما.[96]

٢- بـەپێی وتـەکانی تـوینبی بێت،کـەمال ئـەتا تـورك بـە یـەکجاری شەریعەتی لەتورکیادا گسك داوە.

٣-ئەتا تورك زۆر هەوڵیدا تورکیایەك دروست بکات کە بەشێك بێت لە پاریس یان لەندەن،بێ گومان هیچ شتێکی لەو ولآتانەوە نەگواستەوە بۆ تورکیا،جگە لە بەد ڕەوشتی و بێ بڕوایی و نەفامی،بریا پیشە سازی و زانیاری لێ وەربگرتنایە.

٤-ئـەتا تـورك چاڵێکی زۆر قـوڵی لـەنێوان عـەرەب و تورکـدا هەڵکەنـد، هەروەك کانتول سمس ئاماژەی پێ کردوە.[97]

٥-دەستەکانی  جولەکە لەسەرەتاوە لەپشتی حکومەتەکەوە بوون، لەم بارەوە ونستون ستون[98] دەڵێت: لە سەرەتادا کەسانی کارامە، هاوکارو بزوێنـەری کۆمەڵـەی ئیتیحـادو تەرەقی،ئەنـدامانی ئـەو کۆمەڵەیـە بـوون کەجولەکە یاخود جولەکەی بەناو موسڵمان بوون، هاوکاری داراییش لە ڕێی جولەکـەی دۆنمـەو جولەکەدەوڵەمەنـەکانی سـالۆنیکەوە بـە دەسـت دەگەیشت، هـەر لەبـەر ئـەوە بـوو جولەکـە و ڕۆژئاواییـەکان دەیـان ویـست

---

[96] - تەفسیری ڕامان.

[97] - بڕوانە: (الاسلام فی عصر الحدیث، ص١٩٤، الاسلام والحضارة الغربیة، محمد محمد حسین، ص١٧٦).

[98] - بڕوانە: (نشأة القومیة العربیة، ص٢٠٧-٢٠٩).

کاولکاریەکانی ئەتا تورك ناو بنێن چاکسازی ئیسلامی، لەم بارەوە سمس دەڵێت: نازناوی چاکسازی کەمالی بریتی بوو: لە لادان و داوێن پیسیو خەیاڵ.[99]

٦-ڕۆژئاواییەکان ئاواتەخوازن ئەزمونی کەمالی لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا دوبارە ببێتەوە، هەر لەم ڕوانگەوە سمس پرسیار دەکات سەبارەت بە سەرهەڵدانی ئەتا تورکێکی نویێ لە پاکستاندا.[100]

٧-لە جیهانی ئیسلامیدا هەندێك لە داواکاری کەمالیەکان وەڵام درانەوە،لەو بارەوە شێخی ئەزهەر (علی عبد الرزاق) لە ساڵی "١٩٢٥" دا کتێبێکی بڵاو کردەوە بە ناونیشانی (کتاب الاسلام وأصول الحكم)، ناوبراو بیانوی بۆ کارەکانی ئەتا تورك هێنابویەوە، هەمان کات ئەوەی ڕەت کردبوویەوە کە ئیسلام باسی فەرمان ڕەوایی یان سیاسەتی تێدابێت،کتێبەکەی بۆ زمانی ئینگلیزی و ئۆردو وەرگێڕ درا،ژمارەیەکی زۆر لە کتێبەکانی ڕەوانەی پاکستان کران،هەتا تۆوی عەلمانی بونی دەوڵەت لە ئیسلامدا بخەنە مێشکی لاوەکانەوە،لەم بارەوە سمس[101] دەڵێت: پاکستان لە حاڵەتی بە عەلمانی کردنیدا سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت،تەنها بەوە سەرکەوتوو دەبێت کە باوەڕ بە خەڵکەکەی بکەیت بەوەی دەوڵەتی ئیسلامی لە ڕاستیدا بریتیە لە دەوڵەتی عەلمانی.

هەمان کات چەندین فەتوا لە ئەزهەرەوە دران سەبارەت بە دروستی وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بۆ سەر زمانە بیانیەکان، هەتا بیانو بۆ ئەتا تورك

---

[99]- بڕوانە: (الاسلام فی العصر الحدیث،ص١٦٣).

[100]-بڕوانە: (الاسلام فی العصر الحدیث،ص٣٥٣،الاسلام والحضارة الغربیة،محمد محمد حسین،ص١٦٩).

[101]-بڕوانە: (الاسلام فی العصر الحدیث،ص٣٠٣).

بهێنرێتەوە،سەبارەت بە دروستی ئەنجام دانی نوێژ بە زمانەکانی جگە لە عەرەبی.

٨-ئەتا تورك هەموو هەوڵەکانی خۆی خستەگەڕ، بە ئاڕاستەی بە ڕۆژئاوایی کردنی تورکیاو دابڕینی لە جیهانی ئیسلامی و عەرەبی،بۆ ئەو مەبەستە پیتە عەرەبییەکانی وەلا خست و لە جێگەیاندا پیتی لاتینی دانا،هەمان کات پشتی بەست بە فەلسەفەی یۆنان و فەلسەفەی کۆنی مەسیحیەکان کە دراوەتە پاڵ ئیسلام،هەتا جێگەی ئاینەکەی خوای پەروەردگار بگرێتەوە،هەر لەبەر ئەوەش بوو لەساڵی "١٩٤٦" و پاش مردنی ئەتا تورك فەرمان کرا بە (حسن علی یوسیل) ی وەزیری ڕۆشنبیری تورکیا، بە وەرگێڕانی (١٠٠) کتێبی یۆنانی و (٢٢) کتێبی لاتینی و (١٨) کتێبی فارسی و (١٢) کتێبی زمانی عەرەبی و (٦٢٩) کتێبی کلاسیکی وەرگێراو لە زمانە نوێیەکانی ئەوروپا.[١٠٢]

ئایا دەبینن پشکی ئەدەبی عەرەبی و زمانی قورئانی پیرۆز لەنێو ڕۆشنبیری ئەتا تورکدا بۆ گەلێکی موسڵمان نا دیارە...؟!

٩-خۆ تەرخان کردن بۆ جیا کردنەوەی تورکیا لە جیهانی ئیسلامیو، جەخت کردنەوە لەسەر دروشمی (تورکیا هی تورکەکانە) و لە میسریش (میسر هی میسریەکانە).

لەم بارەوە (کوبلرینغ) لە لویس تۆماسەوە[١٠٣] دەگێڕێتەوەو دەڵێت: مستەفا کەمال توانی نەخشەیەکی فراوان بکێشێت،بۆ دیاری کردنی بارودۆخی مێژوویی و کۆمەڵایەتی، بۆ ئەو بزووتنەوەیەی کە سەرکردە

---

[١٠٢]- بڕوانە: (الاسلام فی العصر الحدیث،ص٣٥٣).

[١٠٣]- لە ساڵی ١٩٤٧ دا لە زانکۆی (برنستون) ی ئەمریکی کۆنگرەیەك بەسترا بۆ کۆمەڵێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، بە ناو نیشانی(الشرق الادنی مجتمعته وثقافته).

هاوچەرخەکانی بەرهەم بهێنێت،ئەمەش لەپێناو بەدیهێنانی باوەڕبوون بەوەی (تورکیا هی تورکەکانە)،ئەو باوەڕەی کە زۆربەی گەلانی ناوچەکە لەسەری ڕۆیشتون،هەر لەبەر ئەوەشە کەمالیەکان دەڵێن[١٠٤]: دەمانەوێت ئیسلامێکی تورکی دروست بکەین،کە تایبەت بێت بە خۆمانەوەو بەشێك بێت لە کۆمەڵگا نوێیەکەمان، هاوشێوەی کەنیسەی ئەنجلیکانی، بێ گومان ئەم کەنیسەیەش لە سەر شێوەو شێوازێکی ئینگلیزیدایە.

هەروەك ئەم بەرنامەیە لە میسریشدا هەوڵی جێ بە جێ کردنی درا،لەم پیلانەشدا بە ئاشکرا دەستی ڕۆژئاواو ئینگلیزەکان دەبینرا،بە ئاڕاستەی بە فیرعەونی کردنی میسر.

لەم بارەوە تەها حسێن دەڵێت: ناسنامەی میسر فیرعەونیە،پێش ئەوەی عەرەبی بێت.

هەروەها دەڵێت: ئەگەر ئیسلام لە نێوان من و فیرعەونیەتیم بوەستێت، ئەوا من دەسبەرداری ئەو ئیسلامە دەبم.

ئەحمەد شەوقیش لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

وجه الكنانة ليس يغضب ربكم ان تجعلوه كوجهه معبودا

واتە:ڕووی کینانە (میسر)خواتان ناڕەنجێنێت، ئەگەر وەك ڕووی خوای لێ بکەن و بیپەرستن.؟!

هەروەها لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ میسر دەڵێت:

ادير اليك قبل البيت وجهى اذا فهمت الشهادت والمتابا

واتە: (ئەی میسر) پێش کەعبەڕووم بۆتۆ وەردەگێرم، ئەگەر شاهێدی دان و پەشیمان بونەوە بێنە وەلاّم.

---

[١٠٤]- بڕوانە:(کتێبی "الاسلام والحضارة الغربية"،محمد محمد حسين، کە ئەمیش لە کتێبی "الاسلام في العصر الحديث"ی کانتول سمس وەری گرتوە).

هەروەك حافز ئیبراهیمیش دەڵێت:

انا مصري بناني من بنى هرم الدهر الذى اعيا الفنا

واتە:من میسریم پەنجەكانم لە پەنجەی ئەوكەسانەن، كە هەرەمیان دروستكردوفەنایان ماندووكرد.

مایەی سەرسوڕمانیش نەبێت لەلاتان، ئەگەر گرنگی دانی ڕۆژئاوا بە مۆزەخانەو شوێنەوارە دێرینەكان مەرام گەلێكی خۆیانی لە پشتەوە بێت،بە ئامانجی لەبیر بردنەوەی ئیسلام و خەریك كردنی موسڵمانان بەو شوێنەوارە دێرینانەی كە پێش ئیسلام لە ولاَتەكانیاندا بونیان هەبووە، پێش سەدەیەك لەمەوبەر ڕۆژئاواییەكان، دەستە ڕۆژئاواییەكانیان پێك هێنا،بۆ سەرپەرشتی كردنی گەڕان و پشكنین بە دوای شوێنەوارە دێرینەكانی جیهانی ئیسلامیدا،بە ئامانجی پەیوەست كردنی موسڵمانان بەو شوێنەوار و داب و نەریتانەی كە بۆ پێش ئیسلام دەگەڕێنەوە،بۆ ئەو مەبەستە (بواتا) و (لایارد) هاتن بۆ عێراق و (ماریت) بۆ ولاَتی میسرو (شلیمان) یش ڕەوانەی توركیا كرا،پاشان فەرمانگەی تایبەت بە شوێنەوار و مۆزەخانەی نیشتیمانی دروست كرا.

نابێت لەلاتان سەیر بێت،ئەگەر بڵێم: نهێنی بەخشینی ئەو دە ملیۆن دۆلارە لە لایەن دەزگای (روكفلر) ی جولەكەوە بەمۆزەخانەی شوێنەواری فیرعەونیەكان، دروستكردنی پەیمانگایەك بۆ دەرچوانی شوێنەوارناسی..، ئەمە تەنها بۆ ئەوەیە ئیسلام بیر موسڵمانان ببەنەوە و بەشتی لاوەكییەوە خەریكیان بكەن.

ئەگەر سەیری فەلەستینیش بكەین، لە كاتی چاودێری (ئینتیداب) ی بەریتانیا بۆ ئەو ولاَتە،مادەی دووەمی بەسەر فەلەستین دا سەپاند،كە تیایدا هاتوە: لەسەر دەوڵەتی چاودێری كراو پێویستە،لە ساڵی یەكەمداو

له مێژوی جێ بەجێ کردنی چاودێریەکەوە یاسایەکی تایبەت بە شوێنەوار دەربکات....

بێ گومان هەموو ئەمانە لەپێناوی ئەوەدان کە موسڵمانان لە ئیسلامەکەیان دابڕن و پەیوەستیان بکەن بە سەردەمی نەفامییەوەو بەمەش دەتوانن موسڵمانان بە کۆیلەی خۆیان بکەن و بیان خەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

لەم بارەوە دکتۆر (ولسون) لە کۆنگرەی ڕۆشنبیری ژیانی هاوچەرخدا کە لە زانکۆی (برنستون) و لە ساڵی "١٩٥٣" دا بەسترا دەڵێت: لەم ڕۆژانەداو لە وڵاتانی ڕۆژئاوای ناوەڕاست و خوارووداـشۆڕشێکی شارستانی بەڕێوەیە، ئەمە لەلایەکەوە هەنگاوێکی نوێیەو هەمان کات گەڕانەوەیە بۆ سەردەمەکانی ڕابردوو.

١٠- ڕۆژئاواییەکان کەمال ئەتا تورکیان وەك پاڵەوان و دروست کەری مێژوو خستە بەرچاو، ئەمەش لە پێناوی ئەوەدا بوو هەتا ئەزمونی کەمالیزم لە ناوچەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامیداو لەسەر شێوەی دەستەیەکی سەربازی دوبارە بکەنەوە، لە پێناو ئەو ئامانجەدا ئەتا تورکیان کردە پێشەنگ و پێشڕەو و نمونە، هەتا ئەوانەی هاوڕان لەگەڵ ئەتا تورکدا باوەڕی ئەویان هەیەو،پاش ئەو دێن، ڕێچکەکەی بگرنە بەر، بێگومان لێرەو لەوێ زۆر جار دەبینین و دەبیستین کە کەسانێك هاتونەتە سەر کورسی فەرمان ڕەوایی و،لە وتەو لێدوان و یادەوەریەکانیاندا کردارەکانی ئەتا تورك دوبارە دەکەنەوەو خۆیان بە سەرۆك و دروست کەری مێژوو ناو دەبەن.

لـەم بـارەوە سمـس دەڵێـت: شـتێكی ڕون و ئاشـكرایە ئێمـە هـەرگیز ئاواتەخوازی شكستی شۆڕشەكەی مستەفا كەمال نین، لەو بڕوایەشدا نین ئەو ئەزموونە بتوێتەوەو لەناو بچێت.

١١-جەخت كردنەوە لەسەر بڵاو كردنەوەی ئەو عەلمانیەتەی كە ئەتا تورك بەدرێژایی ژیانی خۆی لە هەوڵی جێ بە جێ كردنیدا بوو لە جیهانی ئیسلامیدا، ڕۆژئاواییەكان بەردەوام لەهەوڵی كپ كردنەوەی ئەو هەوڵانەدان كە بە ئاڕاستەی وەستاندنی ئەو شەپۆلە دەدرێن.

هەر لەبەر ئەوەش بوو عەدنان مەندەریسیان لەسێدارەدا؟چونكە ناوبراو لە هەوڵی گەڕاندنەوەی چەند دروشمێكی ئیسلامیدا بوو،دواجاریش هێزی سەربازییان بەكار هێنا بۆچەسپاندنی عەلمانییەت .

وتەكەی ساداتیش (لە ئایندا سیاسەت نیەو،لە سیاسەتیشدا ئاین نیە)،هەر لەو ڕوانگەوە سەرچاوەی گرتوە،ئەمە هەر هەمان ئەو وتەیە كە كەمالیەكان دوبارەیان دەكردەوە.

هەر لەم بارەوە سمس دەڵێت: عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامیدا لە ڕێگای بەرەو پێش چونیدا درزی برد،شتێكی گونجاوە كە بۆ جێ بە جێ كرنی پەنا بۆ چەك؟یاخود بۆ فشاری سیاسی ببرێت،گرنگ لەوەدایە لە بەرەو پێش چونیدا پشت ببەستیت بەوەی ئاین ڕێی پێ دەدات،بە پێچەوانەوە ئاشتی و پێكەوە ژیان بونی نابێت لەناو تاك و كۆمەڵدا.

هەر لەبەر ئەوە بوو كاتێك ئەتا تورك لەسەر جێگەی مردنەكەی، زۆر گێلانە داوای لە باڵیۆزی بەریتانی كرد پۆستی سەرۆكایەتی كۆماری توركیا وەربگرێت،"لورین" بە توندی ئەم داواكاریەی ڕەت كردەوە، ئەمەش لە پێناو ئەوەدا بوو پیلانەكەیان ئاشكرا نەبێت.

بەندە بە وێنەوە ئەو داواکاریەی ئەتا تورکم لەلای خۆم پاراستوە، کە لە لایەن ڕۆژنامەیەکی بەریتانیەوە لە ساڵانی شەستەکاندا بڵاو کراوەتەوە، شتێکی ڕون و ئاشکرایە کە دەستوری تورکیا ڕێگە بە سەرۆك کۆمار دەدات، پاش خۆی کەسێك بخاتە جێگەکەی خۆی.

١٢-کەمالیەکان ناچار بوون ڕێگە بە هەندێ دروشمی ئیسلامی بدەن،ئەمەش خۆڵ کردنە چاوی موسڵمانان بوو،بۆ ئەوە وەهای بگەیەنن،کە ڕێزی بیروباوەڕو هەست و سۆز و دروشمی موسڵمانان دەگرن،ئەم هەڵوێستەی کەمالیەکان تەنها لە ترسی تەقینەوەیەکی توندی جەماوەرییەوە سەرچاوەی گرتبوو،ترسیان هەبوو شۆرشێکی گەردەلولی دژ بەکۆدەتا بۆگەنەکەی ئەتا تورك و جێگرەکەی عیسمەت ئینونوڕوو بدات.

هەر لە ساڵی "١٩٤٦"دا ڕێگەیاندا بە وتنەوەی وانە ئاینییەکان لە قوتابخانەکانداو لەساڵی "١٩٤٧" یشداڕێگەی حەج کردن کرایەوە،ئەم بڕیارەش لە کاتێکدا درا کە ماوەیەکی درێژ بوو حەج کردن لە گەلی موسڵمانی تورکیا قەدەغەکرا بوو،هەروەك لە ساڵی "١٩٤٨" دا ڕێگا درا بە کردنەوەی قوتابخانەی پێگەیاندنی پێش نوێژ و وتار خوێن و، ساڵی "١٩٥٠" سەردانی کردنی گۆڕستان ئازاد کرا.

١٣- بێگومان گەلی موسڵمانی تورکیا دووچاری نەخوێندەواری هزری (فکر) بوو،ئەمەش پاش ئەوە هات کە ماوەیەك بیرو باوەڕو کەلەپورو ڕۆشنبیری پێنج سەد ساڵی ئیسلامییان لێ قەدەغە کرا، پاش ئەوەی کە نووسین بەو پیتانەیان لێ قەدەغە کرا، کە وەك میرات نەوە لە دوای نەوە بۆیان مابونەوە،دواتر نەوەیەك لە تورکەکان لە دایك بوو کە ئاین و بیرو باوەڕو ئامانج و ڕۆشنبیری خۆی نەدەناسی (نەوەیەکی ونبوو و سەرگەردان و وێڵ وسەرلێشێواو).

وەك پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِى سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ الحجــر: ٧٢. واتــە: دە بــە گيــانی تــۆ ئــەی موحوممــەد (ﷺ) ! ئەوانــە لــە گێــژاوی مەسـتی و بـێ هۆشـی و سەرلێـشێواوی خۆیانـدا یارییـان دەکـردو بەیەکـدا دەهاتن؟چونکە ئاگایان لێ نەبوو بەیانی چییان لێ دێت...[105]

بـەڵام سروشـتی پـاکی تورکـەکان، دەسـت بـەرداری هـەموو ئـەو هیـزرە بۆگەن و نامۆیانە دەبێت، بێ گومان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەم بنـەما پوچـەڵانەی کەمالیەکان ڕیسواتر دەبن، موژدەکانیش ئاماژە دەدەن بۆ سەرکەوتنێکی نزیك، ئایا سبەینێ نزیك نییە؟

وەك پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴾ الإســـراء: ٥١. واتـــە:...ئەوســـا لـــە ڕووی ئینکارییـــەوە دەســـت دەکەنـــە ســـەرە لـــەقێ و دەڵـــێن: باشـــە ئـــەو زینـــدوو بوونەوەیە، کەی دەبێت؟ پێیان بڵێ: لەوانەیە هاتنی نزیك بێت و هەر پێش دێت.[106]

بــە یارمــەتی خــوای پــەروەردگار پــارتی ئاشــتی هــیچ کــات نامرێــت، هەرچەندە تیرۆر و داپڵۆسین و دامرکاندنەوە لـە دژیان بـەردەوام بێـت، وەك خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾ آل عمران: ١٢٦. واتە:... خۆ سەرکەوتن تەنها بە دەسـتی خـوای بـاڵا دەسـت و کار جوانە.[107]

---

[105] - تەفسیری ڕامان.

[106] - تەفسیری ڕامان.

[107] - تەفسیری ڕامان.

لێرەدا دەمەوێت بە حکومەتە سەربازیەکەی تورکیا بڵێم: بەئاگابن..؟ ئێوە هەرگیز ناتوانن مردووەکان زیندو بکەنەوە، بێ گومان ئەزمونی کەمالی لە ڕێگە دایە بەرەو پەرتەوازەبوون ولە ناو چون، ئەمەش پاش ئەوە دێت گەل زۆری بە دەستانەوە چەشت، لە ڕماندنی خەلافەتی ئیسلامی و سەختی ژیان و بێ بەش بوونی لە تام و چێژی خۆشیەکانی ژیان، سەردەمێکی زۆر گەلتان بێبەش کرد لە ئارامش و دڵنیایی کە پێشتر لە ژێر سایەی ئەم ئاینەدا بە دەستی هێنابوو.

١٤- لە ڕووی پێشکەوتنەوە لە سەرەتادا تورکیا لەگەڵ یاباندا هەنگاوی دەنا، ئەی ئێستا کوا ئەو پێشکەوتنانەی تورکیا؟ بێ گومان لە ئێستادا یابان بە پێشکەوتووترین وڵاتی پیشەسازی دادەنرێت لە جیهاندا، ئەمە لە کاتێکدایە تورکیا مایە پوچی و لەناو چوون بەرۆکی گرتوە، سێ ساڵ پێش ئێستا خەریك بوو بانکی نێودەوڵەتی مایە پوچی تورکیا ڕابگەیەنێت، ئەگەر سعودیە بە هانایەوە نەچوبایە، بێ گومان تورکیا لەناو دەچوو.

١٥-جولەکە کۆنترۆڵی هەموو دەزگا جیاوازەکانیان کردبوو، بێ گومان کەمال ئەتا تورکیش لەم بارەوە پێگەی گرنگی بە جولەکە دابوو، لەوانەش (خالدة ادیب) وەزیری ڕۆشنبیری تورکیا، ناوبراو ئافرەتێکی جولەکە بوو،هەمان کات لەبەر زۆر نزیکی لە کاری ڕۆژنامەگەرییەوە نازناوی (جان دارك)ی تورکەکانیان پێ بەخشی بوو.

باوکی (خالدة ادیب) کە ناوی ئەدیب ئەفەندییە، یەکێك بوو لەو کەسە ڕەگەز پەرەستانەی کە بانگەشەی بۆ بزووتنەوەی (تۆرانی)ی دەکرد،(خالدة ادیب) خاوەن جوانییەکی لە ئەندازە بەدەر بوو،هەمان کات لەگەڵ ئەتا تورکدا خەریکی کاری بەد ڕەوشتی و لادان بوو.

ناوبراو چەند ڕۆمانێکی بەناو بانگی نووسیوە، وەك (طوران الجدیة) و (أضربوا الغانیة)[١٠٨]، لە کۆتاییدا لەگەڵ ئەتا تورك ناکۆکییان لە نێواندا دروست دەبێت و بەرەو دەرەوەی وڵات هەڵدێت،ئیدی پاش مردنی ئەتا تورك دەگەڕێتەوە تورکیا، بەو شێوەیە بەردەوامی دا بە هێڵی کار کردنی جولەکە لە تورکیادا.

جولەکە ڕوانگەی ڕاگەیاندنیشیان تەنها بۆخۆیان تەرخان کردبوو، موسڵمانان و تورکەکانیش تیایدا بێبەش کرابوون.

بۆ نمونە:

ڕۆژنامەی (حریت) ی جولەکە، ڕۆژانە تیراژی یەك ملیۆنی لێ چاپ و بڵاو دەکاتەوە، ئەم ڕۆژنامەیە لە لایەن دەزگایەکیشەوە دەردەچێت،کە گۆڤاری وەك (مجلة الحیاة) و (مجلة التأریخ)یش بڵاو دەکاتەوە، خاوەنی ئەم دەزگایە خێزانێکی جولەکەی دۆنمەیە و هەمان کات چەندین نوسەری چەپی تورکی لە خۆ دەگرێت.

پاش ڕۆژنامەی (حریت)،ڕۆژنامەیەکی دیکە هەیە بە ناوی (ملیت الترکی)،ئەم ڕۆژنامەیەش لەلایەن خێزانێکی جولەکەوە سەرپەرشتی دەکرێت بەناوی (أیبکجی)، نوسەری بە ناوبانگی جولەکە (سامی کوهین) لەو ڕۆژنامەیەدا کار دەکات، هەروەها ڕۆژنامەی (جمهوریت) کە لە لایەن یونس نادی دامەزراوە، ئەم ڕۆژنامەیەش چەپ ڕەوەو هەمان مافی خاوەندارێتی دەگەڕێتەوە بۆ جولەکەیەکی دۆنمە بەناوی (نوری تۆزن).

لە ڕووی هەیمەنەی جولەکە بەسەر ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانەوە لە تورکیا، جولەکەی بەناو بانگ (حم أیبکجی) ماوەیەکی زۆر بەڕێوەبەر بووە، لەو

---

[١٠٨]- بڕوانە: (الیهود الدونمة، ص٤٤).

پۆستەدا مایەوە هەتا نەجمەدین ئەربەکان بە بڕیارێك دوری خستەوە، سەرۆك کۆمار ڕەتی کردەوە کە واژۆ لەسەر دورخستنەوەی ناوبراو بکات،بەلاَم وەزارەت پێداگری لەسەر دورخستنەوەکە دەکرد،دواتر و بە ناچاری لە سالَی "١٩٧٥" سەرۆك کۆمار واژۆی دورخستنەوەی کرد.

دووبارە بە حکومەتی سەربازی تورکیا دەلَیَم: چاکتر وایە گەلی تورکیا پەیوەست بکەنەوە بە ئیسلامەکەیانەوەو، جارێکی تر بنەماکانی ئەم ئاینە لە بنیات نانەوەدا بەکار بهێنن،لە بری ئەوەی بتەکانی ئەتا تورك لە گۆڕەپانەکاندا دابەش بکەن.

لە کۆتایی دا پێم خۆشە ئامارە بە ڕاستییەك بکەم: پێش لەناو چونی ئەتا تورك و مردنی،وەسیەتی کردبوو کە نوێژی مردوی لەسەر نەکەن، لەم بارەوە کەسە نزیکەکانی خۆی ناکۆکییان تیَ کەوت،هەندێکیان بۆچونیان وەها بوو کە دەستور ڕێگە نادات نوێژی لەسەر بکرێت؟ هەندێکی تریان بە پێویستیان دەزانی لەم بابەتەدا دەستور تیَ بپەڕێندرێت و نوێژی مردوی لەسەر بکرێت؟ لە کۆتاییدا یەك لە بەندوڵەکانی ...کەمال ئەتاتورکیان پێش خست و نوێژی لەسەر کردو، بەرپرسیاریەتی ئەو تاوانە قێزەونەی لە ئەستۆ گرت..!!

لە کۆنەوە موتەننەبی وتوویەتی:

وکم ذا بمصر من المضحكات وإن كان في شأنه كالبكاء

منیش دەلَیَم: چەندین بابەت لە تورکیا جێگای پێکەنین و ئازارو لەناوبەری میللەتن.

سەرنج بدەن و ورد ببنەوە!!؟ پەروەردگار چەند جوانی فەرمووە: ﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٥٠ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٥١ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٥٢ وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾ النمل: ٥٠-٥٣.واتە: ئەو تاوانبارانە فرت و فێڵیان ئەنجامدا، ئێمەش پلانێکمان سازاند بۆ لەناو بردنیان،کە ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، سا بنوارەو بیر بکەرەوە! بزانە سەرئەنجامی پیلان و کەتن و فێڵەکەیان چۆن بوو؟ بێ گومان ئێمە بەوانیشەوە هۆزەکەیانمان پێکڕا لەناو بردن، بەهۆی زەمینلەرزەوە؟! ئەوەش خانووەکانیان دەیان بینی کاول و چۆڵن لەبەر ستەم و ناهەقییان، بەڕاستی لەوەدا بەڵگە هەیە لەسەر دەسەڵاتی خوا، بۆ گەلێك بزانێ و پەند وەربگرێت،ئەوانەش کە بڕوایان هێنا بوو و پارێزکار بوون، ڕزگارمان کردن.[١٠٩]

# کۆتایی[١١٠]

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك و أتوب إليك، وصلى الله وسلم وبارك على

[١٠٩] - تەفسیری ڕامان.

[١١٠] - بەپشتیوانی خوای گەورە لە شەوی شەممە "٢٠١٣/٦/١"دەستم کرد بە وەرگێڕانی ئەم کتێبەو، سوپاس بۆ پەروەردگار لە ڕۆژی هەینی "٢٠١٣/٦/٧" دا کۆتایی بە وەرگێڕانەکەم هات.

سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم. سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين، والحمد لله رب العالمين..

**ناونيشانی وەرگێڕ**

**کاروان ڕەشید محی الدین**

karwanrasheed@yahoo.com

**ژمارەی مۆبایل: ٠٧٥٠١١١٦٣١٨**

# سەرچاوەکان

١- حوار في أنقره (كشك).

٢- تاريخ الدولة العثمانية (علي حسون).

٣- الرجل الصنم (ضابط تركي سابق).

٤- تاريخ الدولة العلية (محمد فريد بك، تعليق إحسان حقي).

٥- مصطفى كمال الذئب الأغبر (آرمسترنج، ترجمة حلمي مراد).

٦- الصراع بين الفكرة الإسلامية والفكرة الغربية (أبو الحسن الندوي).

٧- أعمدة الحكمة السبعة (لورنس).

٨- الرجل الأوحد -ثلاثة أجزاء- (شوكت ثريا آيدمير).

٩- جانقايا قصر مصطفى كمال في أنقرة (فالح رفقي).

# لاپەڕەیەك لە مێژووی جولەکە[111]

[111] ئەم پاشکۆیە راستەوخۆ لە کتێبی فەرهەنگی بانگخوازان / ئەندازیار عوسمان وەرگیراوە

# پێشەکی

هەروەك چۆن گشت پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) دوژمن و ناحەزیان هەبوە، ئاوەهاش پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەر لەیەکەم رۆژی هاتنیەوە دوژمن و ناحەزی بۆ پەیدابوە و بەهەموو جۆرێك دوژمنایەتیان کردوە، سابەڵکو بەخەیاڵی خاویان نووری خوا بەفو بکوژێننەوە ... هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا ﴾ (الفرقان: ٣١).

یەکێ لەدوژمنە سەرسەختەکانی ئیسلام جولەکەیە، کە هەر لەکۆنەوە چی یان پێکرابێ کردویانە، جا ئەگەر پەیمانی خوا نەبوایە بەپاراستنی ئەم ئاینە تا رۆژی قیامەت، ئەوا هەر زوو ئەم ئاینە نەمابوو .

ئەم باسەش لاپەڕەیەکە لەمێژووی ڕەشی جولەکە دژبەهەق و ڕاستی، بەوهیوایەی فەرهەنگی بانگخوزان مایەی بەرچاو ڕونی و هۆشیاری بێت .

(١)

لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا: جوولەکەکان ئالأی دژایەتی ئیسلامیان هەڵکردو ڕێگا نەما نەیگرنە بەر لەدوژمنایەتیەکەیاندا، لەلایەکەوە چەن کەسێکیان بەسەر زارەکی و ڕووکەش موسوڵمان بوون لەبەرەی دووڕوەکاندا کاریان دەکرد و پیلانیان دادەنا ... لەلایەکی دیکەوە هانی کافرەکانیان دەدا و پشتگیریان لێ دەکردن، لەکاتێکدا کە ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ (البقرة: ١٤٦) .

هـەروەك چـۆن منالّەكـەی خۆیانیـان دەناسـی و دەیـانزانی كـەمنالّی خۆیانە ئاوەهاش دەیانزانی كە (محمد) ﷺپێغەمبەری خوایە، بەهۆی ئەو بەڵگەونیشانانەی كەلەتەورتدا هاتبوون، بۆیە قورئان پێیان دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ﴿٧٠﴾ يَـٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَـٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ ال عمران: ٧٠

واتە: (ئەی ئەهلی كتاب (مەبەست گاورو جولەكەیە) بۆ كوفر دەكەن بەئایەتەكانی خوا، لەكاتێكدا ناونیشانی پێغەمبەر ﷺ (محمد) لەو پەڕاوانەدا هاتووە كەخۆتان بەڕاستی دەزانن) .

قورئانی پیرۆز زۆرێك لەفڕوفێڵ و پیلانەكانی جولەكەی ئاشكرا دەكرد و مسوڵمانانی لێ ئاگادار دەكردەوە هەروەك ئەم پیلانەیان كە قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَـٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٧٣﴾ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾ آل عمران: ٧٢ - ٧٤

واتـە: (دەستەیەك لـەخاوەن نامـە بەیەكتریان ووت: سـەرلەبەیانیان (بـەفێڵ) بـڕوا بێـنن بـەو قورئانـەی كەنێراوەتـە خـوارەوە بـۆ ئەوانـەی كەموسـوڵمان بـوون، وەدەمـە و ئێـواری لێـی پەشـیمان ببنـەوە، بـەڵكو ئەوانیش پەشیمان بكەنەوە، وەئەم قسەیە بانهێنێ ناو خۆمان بێت و كەس لێتانی نەبیستێت مەگەر هاودینەكانمان) .

بەڵێ مەبەستی جولەکە ئەوەبوو تازە موسوڵمانەکان تێك بدەن و چەواشەیان بکەن، کاتێ بەیانیان جولەکەکان موسوڵمان دەبوون، موسوڵمانان بەگشتی و تازەکانیش زۆر دڵخۆش دەبوون و دەیان ووت: دیارە ئاینەکەمان زۆر ڕاست و تەواوە بۆیە ئەوەتا جولەکەکانیش موسوڵمان دەبن، وەکاتێ ئێواران پەشیمان دەبوونەوە گومان دەکەوتە دڵی تازەکانەوە و ودەیان ووت: دیارە ئاینەکەمان کەم و کوڕی و ناتەواویەکی هەیە، بۆیە جوولەکەکان پەشیمان دەبنەوە ...

ئەی (محمد) پێیان بڵێ بەڕاستی ڕێنمونی هەر ڕێنمونی خوایە وەئەو فڕوفێڵەی کە دەی کەن لەبەر ئەوەیە کەپێتان گرانە هاوشێوەی ئەوەی دراوە بەئێوە لەنامە و پێغەمبەرێتی بدرێت بەکەسانی دیکە، یان موسوڵمانان کێشەودەمەقاڵێتان لەگەڵ بکەن و بۆڕتان بدەن بەهۆی ئەو نامەیەی کەلای خواوە بۆیان هاتووە .

پێیان بڵێ: بەڕاستی فرستادەیی بەهرەیە و خوا ڕەحمەتی بێپایانە و دانایە، دەیدا بەهەرکەسێك بیەوێ، وەخوا خاوەنی فەزڵی گەورە و بێئەندازەیە .

ڕۆژێك لەسەرەتای ساڵی چواردەهەمی کۆچیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دەکەس لەهاوەڵانی دەچن بۆ گەڕەکی (بني النضير) بۆ کارێك، بەڕواڵەت جولەکەکان پێشوازیەکی گەرم و گوڕیان لێدەکەن و پێغەمبەری خوا ﷺ داوای چیان لێ دەکات، ئەوان بەڵێنی پێدەدەن و ڕازی دەبن بەڵام لەژێریشەوە ڕاوێژی کوشتنی دەکەن و دەڵێن: هەرگیز هەلی وامان بۆ هەڵناکەوێت، یەکێکیان دەنێرن لەسەربانەوە بەردێکی گەورە بدات بەسەریدا، لەوکاتەدا خوای پەروەردگار بەسروش پێغەمبەرەکەی ئاگادار دەکاتەوە و لەئەنجامی ئەمەدا پێغەمبەری خوا لەناوچەکە دەریان دەکات .

فێڵو پلانی جولەکە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺئەوەندە زۆرە چەندەها پەڕاوی دەوێت، کەزۆربەی لەپەڕاوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ باسکراون .

(٢)

**لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب دا :**

لەم سەردەمەشدا وەك پێشتر جوولەکە بەردەوام بوون لەئاژاوە چێتی و خراپە نانەوە، بۆنمونە (ابولؤلؤە) ی مەجووسی کە غولامی (مغیرەی کوڕی شعبە) بوو، لەمەدینەدا خەریکی ئاسنگەری و دارتاشی بوو، ڕۆژێك هاتەلای عومەر ڕەزای خوای لێبێت و شکاتی کرد لە (مغیرە) لەسەر مەسەلەی پارەودەسکەوت ... عومەریش پێی فەرموو: _ دەستت ڕنگینە و دەستکەوتت باشە، لەخوا بترسە و چابە لەگەڵ (مغیرە)دا ....

(ابولؤلؤە) بەتوڕەیی یەوە ڕۆیشت و ووتی: (دادگەرێکەی هەموو کەسێکی گرتۆتەوە من نەبێت) .

ڕۆژێك (عومەر)ﷺ بە (ابولؤلؤة) گەیشت و لێی پرسی: تۆ نەت ووت ئەگەر بمەوێ ئاشێك دروست ئەکەم بەڕەشەبا ئیش بکات ... ئەویش بە تووڕەیی‌یەوە وەڵامی دایەوە و ووتی: ئاشێکت بۆ دروست ئەکەم خەڵکی هەموو باسی بکەن .

عومەر بەوانەی فەرموو کەلەگەڵی دابوون: ئەو عەبدە هەڕەشەم لێ ئەکات، سەرەنجام (ابولؤلؤە) و (هرمزان) – کەبەدیلی هێنرابوو بۆ مەدینە پاش شکانی فارسەکان – وە (جفینە) کەگاوربوو، لەگەڵ (کعب الاحبار) کە جوولەکەبوو بەسەرزاری موسڵمان بوبو، هەستان بەدانانی پیلانێك بۆ کوشتنی (عومەر) ... وە ئەوەبوو پاش ماوەیەك لەنوێژی بەیانی‌دا شەهیدیان کرد[1]. لەم کارەساتەشەوە بەئاشکرا دەستی تاوانی جوولەکە

ئاشکرا دەبێت کەهەردەم یان خۆیان یاخود بەبەشداری لەگەڵ کەسانی دیکەدا هەوڵی زیان گەیاندنیان داوە بەئیسلام و موسوڵمانان .

(٣)

<u>لەسەردەمی عوسمانی کوڕی عەففاندا</u>: لەسەردەمی عوسماندا ﷺ شاری کوفە ئاژاوەی تیا بەرپابوو بەهۆی (مالکی حارسی نخعی) یەوە کە بە (ئەشتەر) بەناوبانگ بوو . والی کوفە (سعیدی کوڕی عاص) و (معاویە) والی شام بەرێك و پێکی چارەسەری ئەو کێشەیەیان کرد .

لەشاری (بصرە) ش یەکێك لە (بنی عبدالقیس) لەگەڵ کۆمەڵێکدا کەوتنە خراپەکاری، موسڵمانان لای (عوسمان) شکاتیان لێکرد و ئەویش فەرمانیدا بەوالی (بصرە) کەدەست بەسەریان بکات و نەیەڵێ پەیوەندی بکەن بەخەڵکەوە و خەڵکی تێك بدەن .کاتێ جوولەکەکانی یەمەن ئەم دەنگ و باسەیان بیست، یەکێکیان لەخۆیان نارد کە ناوی (عبداللە کوڕی سبأ) بوو وە بە (ابن السوداء) بەناوبانگ بوو لە یەمەنەوە بۆ لای کابرای (بنی قیس) لە (بصرە) وەبەیکەوە کەوتنە بلاۆکردنەوەی دووبیروڕا:

یەکەم: مژدەدان بەخەڵکی کە محمد ﷺ دەگەڕێتەوە سەرزەوی، وەدەیوت: سەیرە ئێوە پێتان وایە عیسی سەلامی خوای لێبێت دەگەڕێتەوە و محمد ﷺ ناگەڕێتەوە ... بەمەش بیروباوەڕی خەڵکیان دەشێواند، ئەمەش زۆر بۆیان نەچووە سەر بۆیە کاریان لەسەر بیروڕای دووەم کرد کەدەیان ووت: هەموو پێغەمبەرێك (وصی) هەیە وە (علی) یش (وصی) محمد ﷺ ە، بۆیە دەبێت کاروبار بدرێتە دەست (علی) وەکەوتنە زەمی کاربەدەست و والی یەکانی (عوسمان) لەژێر پەردەی فەرماندان بەچاکە و جڵەوگیری لەخراپە ... پاشان (عبداللە ی کوڕی سبأ) چوو بۆ

(کوفه) و پەیوەندی بەست لەگەڵ (مالکی کوڕی حارسی نخعی) و پاشان چوو بۆ (مصر) و لەوێش کەوتە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە خراپەکانی .

لەساڵی سی و پێنجی کۆچیدا توانا و دەسەڵاتی باشیان پەیداکرد و هەرسێ کۆمەڵەی (مصر) و (کوفه) و (بصره) پەیمانیان بەست کەبچنە سەر (مەدینە)کاتێ گەیشتنە دەورووبەری مەدینە، داوای لابردنی (عوسمان) یان کرد، (عوسمان) یش ﷺ خەڵکەکەی کۆکردەوە و ئەو پڕوپاگەندانەی کرابوون بەدرۆی خستنەوە و یارانیش کەلەوێ ئامادەبوون گەواهی یان بۆدا .ئینجا ڕایگەیاند کەیارانی پێغەمبەر ﷺ هەرچی بڵێن لەفەرمانیان دەرناچێت و خەڵکەکەش بەمە ڕازی بوون و هەر کۆمەڵە گەڕایەوە شوێنی خۆی .

ئاژاوەچیان نامەیەکیان بەناوی (عوسمان) ەوە نووسی و خستیانە ناو ئەو نامانەی کەبەپۆستەدا دەنێران بۆ (مصر)، کەتیایدا نووسرابوو بۆ والی (مصر) کەسەرۆکی وەفدەکان بکوژێ لەکاتی گەڕانەوەیاندا ......

لەڕێگادا ئەو کۆمەڵەی بەرەو (مصر) دەگەڕانەوە، پۆستەچی یەکەیان گرت و نامەکانیان پشکنی و ئەو نامەیەیان بەرچاو کەوت، بەمەش کۆمەڵەکەی (مصر) گەڕانەوە بەرە و (مدینە)، سەیر لەوەدابوو هەروەك پیلانێکی لەوەو پێش هەبوو بێت بۆ ئەم کارە، دوو کۆمەڵەکەی (کوفه) و (بصره) ش لەهەمان کاتدا گەڕانەوە ......

پێشەوا (علی) بەمەی زانی و لە ئەهلی (کوفه) و (بەصره)ی پرسی: چۆن بەحاڵی ئەهلی (مصر) تان زانی لەکاتێکدا لەیەك دوور کەوتبوونەوە ؟ دیارە ئەمە هەر لە (مەدینە) ڕێکتان خستبوو ؟!

وتیان: چۆنی لێك دەدەیتەوە کەیفی خۆتە، ئێمە دەمانەوێت پێشەوا(عوسمان) لابچێ و لەکاربخرێت ...

هەندێ لەیارانی پێغەمبەر ﷺ رایان وابوو کەشەڕ لەگەڵ ئاژاوەچی یەکاندا بکرێت بەلاّم (عوسمان) ﷺ حەزی نەکرد خوێن بڕژێت، تا لەئەنجامدا هێرشیان بردە سەرماڵی پێشەوا (عوسمان) و شەهیدیان کرد و ئاژاوەو پشێوی زۆر کەوتەوە، ناچار پێشەوا (علی) بووە خەلیفە و لەسەر داوای زۆربەیموسوڵمانان .

(٤)

**لەسەردەمی ( علی کوڕی ابی طالبدا ):**

(عبدالله ی کوڕی سبأ) لەژێر پەردەی خواشناسیدا خۆی لەپێشەوا (علی) و موسڵمانان نزیك دەکردەوە، تاوای لێهات لەڕیزی پێشەوەدا لای قادرمەی مینبەرەکەی پێشەوا (علی) یەوە دادەنیشیت و بەردەوامیش پڕوپاگەندەی ژەهراوی بلاّودەکردەوە، وەك ئەوەی کەپێشەوا (علی) دەبوایە پێغەمبەر بوایە، یان لای هەندێ کەسی سادە و ساویلکە باسی خوایەتی (علی) دەکرد (پەنا بەخوا .......) بەمەیش دەیویست چۆن کاتی خۆی ئایینی (مەسیحی) یان شێواند و حەزرەتی (عیسی) یان بە خوا دانا، ئاوەهاش ئیسلامەتی بشێوێنن ...کاتێ پێشەوا (علی) ئەمانەی بیستەوە و زانی سەرچاوەکەی ئەو پیاوە خواپەیە – واتە (عبدالله ی کوڕی سبأ) – ویستی بیکوژێ، بەلاّم (عبدالله ی کوڕی عباس) نەیهێشت و ووتی: نەکوژرێت باشترە .

پاش ئەوەی بەپیلانی جوولەکە پێشەوا (علی) یش شەهید کرا، ئینجا کەوتنە ئەوەی کە (علی) نەکوژراوە وەکو (عیسی) بەرزکراوەتەوە و دەگەڕێتەوە سەرزەوی و دەیان ووت: (علی) لەئاسماندا لەگەڵ هەوردا دێت و دەچێ و هەورە گرمەش دەنگی ئەوە !!! ؟ هەتا وای لێهات یەکێ لە

(سەبەئی یەکان) ئەگەر گوێی لەهەورە گرمە ببوایە دەیووت: (**عليك السلام يا أمير المؤمنين**) !!.

بەڕاستی جێی سەر سوڕمانە پێش بینی یەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دی کە بە پێشەوا (علی) فەرمووبوو: ئەی (علی) تۆ وەك حەزرەتی (عیسی) ت بەسەر دێت، کەهەندێك ئەوەندە بەرزیان کردەوە بەخوایان دەزانی، وەهەندێکیش ئەوەندە نزمیان کردەوە کەبە (منالّی زینایان) لەقەڵەم دەدا (پەنا بەخوا) ......

پێشەوا (علی) ش هەندێ ئاوەها زیادە ڕەویان تیاکرد وە لەلایەکی دیکەشەوە (خوارج) ە کان بەسووکی سەیری پێشەوا (علی)ﷺ [٢] یان دەکرد .

(٥)

**دروست کردنی کۆمەڵەی نهێنی :**

لەساڵی ٢٧٦ ی کۆچیدا جوولەکەیەك لە (کوفە) بەسەر زارەکی موسڵمان بوو بەناوی (میمون کوڕی قداح) وە کە کەوتە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی خراپ و لێك دانەوەی ئایەت و فەرموودە بەوشێوەیەی کە قسەکانی خۆی پێ بسەلمێنێت .

لەئەنجامی هەوڵ و کۆششی (**میمون**) و (**حمدان قرمط**) کەپیاوخراپێکی تربوو، چەندەها کۆمەڵی نهێنی وەك (**قرامطة**) و (**مزدكية**) پەیدابوون کە هەردەم خەریکی ئاژاوەچێتی و ئازاردانی موسوڵمانان بوون . بۆ نموونە:

لەساڵی ٢٨١ ی کۆچیدا (**قرمط**) ی یەکان دەستیان گەیاندە یەمەن و خراپە و ئاژاوەیەکی زۆریان تیا دروست کرد ... وەلەساڵی ٢٨٩ ی کۆچیدا خراپەو ئاژاوە گەیشتە شام و عێراق و لەساڵی ٢٩٠ دا گەمارۆی شاری (دیمشق) یان داو خەڵکێکی زۆریان کوشت .

لەساڵی ٢٩٤ دا ڕێیان گرت لەحاجی یەکانیماڵی خوا و لەساڵی ٣١١ی کۆچیشدا هێرشیان بردە سەر شاری مەککە و کەوتنە کوشتن و تالآن کردن.

ئەمە بێجگە لەوەی چەندەها جار ئەو کۆمەڵە نهێنی یە ئاژاوە گێڕانە دەستیان لەگەڵ (صلیبی) یەکاندا تێکەلآو کردووە و چەندەها جار هەوڵی کوشتنی (صلاح الدین) یان داوە بەتایبەت لەساڵی ٥٧١ ی کۆچیدا

(٦)

## خۆگەیاندنە حوکم

یەکەم: (سعد الدولە کوڕی صفی) ی جوولەکە توانی بگاتە پلەوپایەیەکی بەرز لە سەردەمی مەغۆلی یەکاندا لەساڵی ٦٥٦ ی کۆچی دا، کەئەویش سەرپەرشتکارێتی دیوانی عێراقی بوو، ئەو تاوانبارە خۆی و یار و یاوەرە جوولەکەکانی کەوتنە خراپەکاری و دەست درێژی بۆ سەر موسڵمانان و چەندەها زانا و پیاو ماقوڵیان کوشت، هەتا گەیشتە ئەوەی خەڵکی لەدژیان ڕاپەڕی و تۆڵەی بەرودوایان لەو دەستە و تاقمە کردەوە

دووەم: لەزەمانی (فاطمیە کان) دا (ابونصر صدقە کوڕی یوسف الفلاحی) توانی ببێتە وەزیری خەلیفەی فاطمی لەساڵی (١٠٤٤ تا ١٠٤٧) ی زاینی، وەهەروەك هەموو کاتێکی تریان کەوتنە چەوساندنەوەی موسڵمانان، خەڵکی زۆر نارەحەت و بێزاربوون و بەگشت شێوەیەك نارەزایی خۆیانیان دەردەبڕی، تەنانەت یەکێ لەشاعیرەکانی ئەو زەمانە دەڵێ:

یهود هذا الزمان قد بلغوا غاية أمالهم وقد ملكوا

العز فيهم والمال عندهم ومنهم المستشار والملك

**سێهەم:** لەئەندەلوسدا (ابن نغرالە) ی جوولەکە توانی ببێ بەوەزیری پادشای بەربەریەکا کەناوی _ بادیس) بوو، کوڕی پاشا زۆر ڕقی لەم جوولەکەیە بوو، وەچەند جار داوای لەباوکی دەکرد کەلەسەرکار لای بدات، بۆیە ئەویش کوڕی پادشای دەرمان خوارد کرد و کوشتی . سەرەنجام موسوڵمانانی شاری (غرناطە) بەڕوویدا تەقینەوە و کوشتیان .

چوارەم: لەدوا دوای سەدەی نۆزدەهەمدا (بنیامین دزرائیلی) جوولەکە توانی ببێتە سەرەك وەزیرانی (بریطانیا) و چی بۆ کرا بۆ جوولەکە کردی[٣].

هەوڵ و کۆششی دیکەی جوولەکە بۆ گەیشتنە حوکم و دەسەلآت زۆرە بەلآم لەناملیکەیەکی وا کورتدا هەرئەوەندە بۆنموونە باس دەکرێت، ئاشکراشە کەمشتێك نموونەی خەروارێکە .

(٧)

## ماسۆنیەت:

ماسۆنیەت کۆمەڵێکی سەربە جوولەکەن لەپێناوی ئامانجەکانی جوولەکەدا هەوڵ ئەدەن، سەرەتای دروست بوونیان بەتەواوی نەزانراوە و لەساڵی ١٧١٧ ی زاینیدا بنکەیەکیان لە (بریطانیا ) کردەوە و ناوی خۆیان نا (البنائین الاحرار) کەدژایەتی هەموو ئاینەکانیان دەکرد (بێجگە لەئاینی جوولەکە) وەهەوڵی بلأوکردنەوەی فەساد و خراپەیان دەدا، پاشان چەندەها بنکەیان لە (پاریس و ئەڵمانیا و سویسرا هۆڵەندا و ڕوسیا و سوید و هند) دا کردەوە ...لەساڵی ١٩٠٧ ی زاینیدا، ژمارەی بنکەکانیان لە (ئەمریکا) دا گەیشتە (٥٠) بنکە، کەنزیکەی (یەك ملیۆن ئەمریکی) ئەندام بوون تیایاندا، ماسۆنیەکان ئەوکەسانەیان هەڵدەبژارد بۆ ئەندامێتنی کەپلەوپایەیەکی بەرزی کۆمەلأیەتیان هەبوایە و بێباوەڕبونایە

. پاش ئەوەی یەکێك دەبوە ئەندام سوێندی دەخوارد کەنهێنیەکانیان نەدرکێنێ و بۆ هەتا بیپارێزێ ...

وەئەگەر یەکێك نهێنیەکانیانی بدرکاندایە، دەیانکردە پەند و عیبرەت بۆ خەڵکانیتر و دەیان کوشت .

بۆ نموونە " لە (بریطانیا ) دا زۆر لەپۆلیسەکانی ئەو ولاّتە ئەندامن لەو کۆمەڵەیەدا و هەرچی لەڕێی مەرامەکانی ماسۆنیەتدا بوەستێ دەیکوژن، هەروەك خوێن ڕێژێکیان بەناوی (جاك) پێنج ئافرەتی تیرۆر کرد و لەسەر لاشەکانیان نامەیەکی بەجێ دەهێشت کەتیایدا نوسرابوو (ماسۆنیەت تۆڵە دەستێنێت لەهەموو ئەوانەی کەبە خەیاڵیاندا بێت زیانی پێ بگەیەنن) .زۆر لەسەرکردەکانی ولاّتان سەربەماسۆنیەت بوون، وەك (جیسکار دیستان و میتران و پانزە سەرۆکی ئەمەریکی) .تەنانەت دۆلاری ئەمریکی لەسەر دیوێکی (الختم الاعظم) ی ماسۆنیەتی پێوەیە کە (قوچەکێکە و چاوێکی لەسەرە) [٤] !!

( ٨ )

## هەوڵی جوولەکە بۆ دەست گرتن بەسەر جیهاندا :

جوولەکە خۆیان بەگەلی هەڵبژێرراوی خوا دەزانن و گەلانیتریش وەك خزمەتکار و ژێر دەستە سەیر دەکەن، (تلمود) کەپەڕاوێکی جولەکەکانە هەر لەکۆنە وە پێیان دەڵێ:(گیانی جولەکە جیاوازە لەگیانی خەڵکانی دیکە، چونکە گیانی جوولەکە بەشێکە لەخوا هەروەك چۆن کوڕ بەشێکە لەباوکی بۆیە پێویستە جولەکە بەوپەڕی توانایەوە هەوڵبدات کە گەلانی دیکە دەسەلاّتیان نەبێت و خۆی دەست بگرێت بەسەر جیهاندا و، مرۆڤایەتی بکاتە خزمەتکاری خۆی) .

لەزۆربەی ولآتاندا هەر لەکۆنەوە جوولەکە ئاژاوە و پشێوی ناوەتەوە و هەرکاتێکیش خەڵکانی ئەو ولآتانە بەتاوانکاریەکانیان زانیبن تۆڵەیان ایکردونەتەوە بۆ نموومە:

لە (بریطانیا) کاتێك پادشا (هنری سیٚهەم) بۆی دەرکەوت جوولەکە زێڕ و زیو دەدزن لەدراوەکانی دەوڵەت و دوایی لە (سکە) ی دەدەنەوە ... لەساڵی (۱۲۳۰) ی زایذیدا فەرمانی دەرکرد بۆ جوولەکە کە دەبێت سیٚیەکی دارایییەکەیان بدەن بەدەوڵەت .

(ئەدواردی یەکەم) یش لەساڵی ۱۲۷۳ ی زایذیدا فەرمانی دەرکرد کەنابێت جولەکە سوخۆری و ڕەهنی زەوی و زار بکەن، چونکە زۆربەی پارە و سامانی دەوڵەت دەچووە گیرفانیانەوە ...

وەلەساڵی ۱۲۸۱ زایذیدا فەرمانی لەسێدارەدانی (۲۰۰) جوولەکەی دا، دیسان لەساڵی (۱۲۹۸) دا گەلی (بریطانیا) سکالآی زۆریان کرد لەدەست جوولەکە بۆیە پادشا فەرمانی دەرکرد کەلە سیٚمانگدا جوولەکە (بریطانیا) بەجێبهێڵن، خەڵکەکەش ئەوەندە داخ لەدڵبوون پێش تەواوبوونی مۆڵەتەکە، کەوتنە کوشتن و لەناوبردنی جولەکە و لەقەلآیەکدا (۵۰۰) کەسیان ایٚسوتاندن، بەمەش بۆ ماوەی سیٚسەدە (بریطانیا) لەدەست جوولەکە و خراپەکاریەکانیان رزگاری بوو .

جوولەکەش لەتۆڵەی ئەوەدا سەرکردەیەکی ئینگلیزی بەناوی (ئۆلیڤەر کرۆمۆیلْ) ی کڕی و بەپارە شۆڕشێکیان پیٚهەڵگیرساند و پادشایان پیٚ لەناوبرد .

لەساڵی (١٦٤٩) ی زاینیدا (کرۆمۆیلْ) هێرشی بردە سەر ئێرلاندە بەفەرمانی جوولەکەکان، وەلەساڵی ١٦٥٢ زاینیدا جەنگا لەگەڵ هۆڵەندیەکاندا وناوی خۆی نا (لۆردی پارێزەری ئینگلتەرا) وەلەساڵی

١٦٥٤دا چەند جەنگێکی دیکەی بەرپاکرد، ئینجاکە کرۆمۆیلْ مرد، (چارلسی دووەم) کوڕی (چارلسی یەکەم) فرسەتی هێنا و بوو بەپادشای (بریطانیا) و پەردەی هەڵماڵی لەسەر تاوانەکانی حولەکە و زۆری لێ کوشتن.

**لەفەرەنسادا:**

لەسەردەمی (لویسی نۆهەم) دا بەهۆی جوولەکە وە باری ئابوری فەرنسا تێك چوو، بۆیە فەرمانیدا کە سێیەکی قەرزی جوولەکەکان کەلای فرنسیەکان بوو پێیان نەدرێتەوە، وەفەرمانی دا کە پەڕاوە پیرۆزەکانیان بسوتێنرێ .

لەساڵی ١٣٢١ زدا، فەرەنسیەکان هێرشیان بردە سەر جوولەکەکان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن، وە تا ناوەڕاستی سەدەی شانزەهەم لەفەرنسادا سەریان هەڵ نەدایەوە .

کابرایەکی جوولەکە کەناوی (ینکر) بوو خۆی لەپادشا نزیك کردەوە، تا بووە وەزیری دارایی و ئەوەندەی بۆی کرا ئابووری فەرنسای ڕووخاند و لەلایەکی دیکەشەوە جوولەکە شۆڕشی بەرپاکرد و لەساڵی ١٧٨٩ دا پادشایان لەسێدارەدا .

بەمەش هەقی لەپادشا و فەرنسیەکان کردەوە !.

لەسەرەتای سەدەی (١٩) دا ناپلیۆن وویستی سودیان لێوەرگرێ بەلاّم خیانەتیان لێکرد و ئەویش کەوتە گیانیان وتی: (ئەمانە میکرۆبی مرۆڤایەتین) ...

**لەرووسیادا:**

لەڕووسیاش خەڵکی لەجوولەکە بێزاربوون لەساڵی ١٨٨١ و ١٨٨٢ ز دا ژمارەیەکی زۆر جوولەکەیان لەناوبرد، بۆیە جوولەکەش وەك تۆڵەسەندن و

تێك دانی ڕووسیا كەوتنە پلان دانان بۆ ڕوخاندنی قەیسەر و بانقی جوولەكەكان لە (نیۆیۆرك) زیاتر لە ٢٠ ملیۆن دۆلاری بۆ ئەم كارە تەرخان كرد .

بەهۆی (كارل ماركس و انجلن) كە ماسۆنی بوون، وە بەهۆی هاوكارەكانیانەوە، شۆڕشی ئۆكتۆبەر هاتە دی و بەملیۆنەها كەسیان لەنەیارانیان كوشت و دەربەدەر كرد و زیاتر لە (٣٠) هەزار مزگەوتیان ڕوخاند[٥] .

جوولەكە دەستیان گرت بەسەر هۆكانی ڕاگەیاندن و بلأوكردنەوەدا و ڕۆژنامەی (تایمس) كەگرنگترین و بلأوترین ڕۆژنامەیە، جوولەكە كەلەساڵی ١٧٨٨دا لە بریطانیا دایان مەزراند تا ئێستاش بەردەوامە .

لەئەمەریكادا زیاتر لە ٢٢٠ گۆڤار و ڕۆژنامە لەژێردەستیاندایە و لەفەرەنساشدا زیاتر لە ٣٦ ڕۆژنامە دەر دەكەن .وەلە ئامارێكدا دەركەوت كەزیاتر لە ٨١٩ گۆڤار و ڕۆژنامە بەچەندەها زمان لەجیهاندا دەردەكەن .كارگەكانی بەرهەم هێنانی فیلم لەجیهاندا هەر لەكۆنەوە بەدەست جولەكەوەن وەك كارگەی (الاخوان وارنر) كەهەر لەئەمەریكادا خاوەنی (٥٣٠) شانۆن و ٣٥ وەكالەتی فیلمیان هەیە لەجیهاندا .هەروەها كارگەی (لویس المساهمە) كە خاوەنی زیاتر لە ٢٢٧ ملیۆن دۆلارە، وەكارگەی (كولومبیا) ش بەهەمان شێوە كەخاوەنی زیاتر لە ٣٩ ملێۆن دۆلارە[٦] .

وە دەسەلأتی تەواویان هەیە بەسەر تۆڕی تەلەفزیۆنی ئەمەریكی (C.B.S/ A.B. C/ N.B.C) كەخاوەنی ئەو تۆڕانە بەڕێوەبەرەكانی جوولەكەن[٧]

جوولەكە پەلی هاویشتۆتە زۆر لەكۆمەڵە و ڕێكخراوە جیهانیەیە گەورەكانەوە وەك (هیئة الامم المتحدة، یونسكو ...... هتد) .

لەیەکێ لەبڵاوکراوە نهێنیەکانی کۆمەڵەی (قبالا) ی جوولەکەدا هاتووە کەدەڵێت: (نابینن چۆن مەسەلەی ڕەش پێستەکانی ئەمەریکامان دروست کرد، بۆ ئەوەی ڕەش پێست و سپی پێست سەرقاڵی یەکتری و نەیانپەرژێتە سەر ئیش و کار و بەرژەوەندی یەکانی ئێمە ...

هاوڕێ یان هەندێ لەسیاسیەکانی ئەمەریکا وتیان: گوایە بۆیان دەرکەوتووە کە ئێمە دەستمان گرتووە بەسەر هەردوو حیزبەکەی ئەمەریکادا، لەبەرئەوە ویستیان حیزبێکی دیکە دروست بکەن کە دەستی ئێمەی نەگاتێ، بزانن ئەو حیزبە تازەیەش هەر لەژێر دەسەڵاتماندا دەبێت .

برایان چاك بزانن ئەوەی دەست بخاتە کارمانەوە وەکو (سناتۆر دیس) و (سناتۆر ماکارثی) و (سناتۆر أستلاند) و (سناتۆر والکر) و (سناتۆر فۆرستال)ی لێ دەکەین کەلە پەنجەرەی ماڵەکەیەوە لەناومان برد، ئەوەش کە بە (ماکارثی) مان کرد پێویست ناکات باسی بکەین چونکە هەموو باش دەزانن .

هاوڕێ یان ... دەست گرتنمان بەسەر هەڵبژاردنەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بەئاشکار ەری دەخات کەچەندە کارمان کردۆتە سەر کۆمەڵگای ئەمەریکی، هەرکەپشتی یەکێ لە کاندیدەکانمان گرت ئیتر هاونیشتمانیەکان هەڵی دەبژێرن .

لەوانەشە گەلی ئەمەریکی هەندێ دوژمنایەتیمان لەگەڵدا بکات لەداهاتوودا، بەڵام هەر زاڵ دەبین بەسەریاندا و دەستەمۆیان دەکەینەوە، بەهۆی دامەزراندنی (دەوڵەتی ئیسرائیلی جیهانی) یەوە، وەبزانن کەئێمە زۆر نزیکین لەهێنانە دی ئەم ئامانجەماندا، وە لەداهاتوویەکی نزیکدا دەبینە گەورە و دەسەڵاتداری زەوی و لەژێر سێبەری ئاڵاکەماندا ئاشتی بڵاودەبێتەوە، بۆیە لەگەڵماندا بیڵێنەوە " هەربژی ئومەتەکەمان)[٨].

لەم سالانەی دوایی دا گاورەکان هۆشیار بوونەتەوە و جم و جوولیان تێکەوتووە چەند کۆمەڵێکی وەك (المیثاق، السیف، سلاح الله) یان دروست کردوە، ئەمانە ناڕەزایی دەر دەبڕن و خەڵکی وریا دەکەنەوە لەمەترسی دەست گرتنی جوولەکە بەسەر حکومەتی ئەمەریکادا[٩]

(٩)

رِوخاندنی خەلافەتی ئیسلامی:

ئەو جوولەکانەی دەچوونە تورکیا وەبەسەرزاری و ڕووکەش موسڵمان دەبوون پێیان دەوترا (دونمە)، لەشەڕی جیهانی یەکەمەوە خەریکی گۆڕینی تورکیان بەرەو ژیانێکی دوور لەخوایی و بەرەڵایی، ئافرەتانیان هاندا بۆ فڕێ دانی لەچك و دەیان ووت: (حجاب) لەئیسلامدا نییە و داوای تێکەڵ بوونی کوڕو کچیان دەکرد لەزانکۆکاندا ...

ئەمانە دەستیان گرت بەسەر هۆکانی ڕاگەیاندندا و (احمد امین یالمان) یەکێکە لەڕۆژنامەچییەکانیان کە چەندەها گۆڤار و ڕۆژنامەی دامەزراند وەك ڕۆژنامەی (حریت) و ڕۆژنامەی (گون ایدن) .

لەساڵی (١٩٤٥) دا (صابحە سرتل) ی جوولەکەی ڕۆژنامەی (طنین) ی شیوعی دامەزراند و کەوتە بلاوکردنەوەی شیوعیەت لەتورکیادا، وەلە ساڵی ١٩٥٢دا ڕای کرد بۆ سۆڤیەت . هەروەها گەلێك نووسەریان هەبوو وەك (خالدە ادیب) کەباوکی جوولەکەی (دونمە) بوو، کەلەساڵی ١٩٦٤دا مرد و لەتورکیا پەیکەری بۆ دروست کراوە .

لەدوایی یەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا مەحفەلی ماسۆنی دامەزرا بەناوی (محفل الشرق العثماني) و مامۆستای گەورەی مەحفەلەکە وەزیری ناوخۆبوو، وە ئەندامەکانیشی جوولەکە دەوڵەمەندەکان و کۆمەڵەی (اتحاد والترقی) بوو .

(قرەصو) کە جوولەکەیەکی (دونمە) بوو هاتە لای سوڵتان (عبالحمید) ووتی: (من نێراوم لەلایەن کۆمەڵەی ماسۆنیەکانەوە و داوا لەبەرێزتان دەکەم کە پێنج ملیۆن لیرەی ئاڵتون وەك دیاریەك بۆ خەزێنەی تایبەتی خۆت قبوڵ بکەیت و سەد ملێۆن لیرەش وەکو قەرز بۆ خەزێنەی دەوڵەت بەبێ قازانج بۆ ماوەی ساڵێك بەو مەرجەی ڕێمان بدەن هەندێ (امتیازات) مان هەبێت لە (فەلەستین)، (قورەصو) قسەکەی تەواو کرد سوڵتان سەیری یاوەرەکەی کرد و بەتووڕەییەوە ووتی:

(دەتزانی ئەم بەرازە چی دەوێت ؟!)

یاوەرەکە کەوت بەسەر دەست و قاچی سوڵتاندا و سوێندی خوارد کەنەی زانیوە، ئینجا سوڵتان ڕووی کردە (قرصو) پێی ووت:

بڕۆ وون بە لەبەرچاوم بێ نرخ ! ئەویش بەپەلە چووە دەرەوە و بەپاپۆڕچوو بۆ ئیتالیا و ئەم بروسکەیەی بۆ سوڵتان نارد:

– (تۆ داواکەی ئێمەت ڕەت کردەوە کەئەوەش زۆر دەکەوێت لەسەر خۆت و مەملەکەتەکەت ... !

جوولەکە هەر بێهیوا نەبوون بۆ دووەم جار (هرتزل) و حاخام (موسا لیفی) چوونەوە لای سوڵتان لەساڵی ١٨٩٧ ی زاینیدا زۆر بەشان و باڵی دەوڵەتی عوسمانیدا هاتن و سوپاسی سوڵتانیان کرد ئینجا داوایان لێکرد کە ڕێگەیان بدات لەفەلەستیندا نیشتەجێ بن بەو مەرجەی جوولەکە:

١– کەشتی گەلێکی دەریایی بۆ عوسمانیەکان دروست بکەن .

٢– پشتگیری سیاسەتی عوسمانی بکەن لەولاَتانی دەرەوەدا .

٣– یارمەتی سوڵتان بدەن بۆ چارەسەر کردنی باری ئابووری .

٤– زانکۆیەکی عوسمانی لەقودسدا دروست بکەن تاوەکو قوتابیان لەوێدا بخوێنن و پێویستیان بەچوونە ئەوروپا نەبێت .

کەسوڵتان گوێی لەمانەبوو ووتی: (وادەزانم براجوولەکەکانتان لەو پەڕی خۆش گوزەرانیدان، بەهۆی ئەو چاودێریەی کە ئوممەتەکەم و پادشایانی باوك و باپیرم کردویانن چ ستەمێکیان لێکراوە نەمان زانیبێت؟!) .

حاخام (موس لیفی) ووتی: استغفر الله ئەی گەورەمان، هیچ سکالأیەکمان نییە، تەنها ئەوەندە هەیە دەمانەوێت جوولەکە پەرتەوازەکانی جیهان کۆبکەینەوە، نیشتمانێکیان بۆ دروست بکەین تاوەکو هەتایە دوعا بکەین بۆ جەنابتان) .

سوڵتان ووتی: (ئێوە لەهەموو هاوڵآتیان زیاتر سوود لەبەروبوومی وڵآت وەردەگرن، حاخام وانییە ؟ !) .

ئینجا هەموو مات و بێدەنگ بوون (هرتزل) بێدەنگیەکەی بڕی ووتی: (بۆ نموونە ئەگەر مەولامان قایل بوایە هەندێ زەوی و زاری لەفەلەستین پێ بفرۆشتینایە کەهی کەس نین و بەونرخەش کەدای دەنێن) .

سوڵتان تووڕەبوو نەڕاندی بەسەریاندا ووتی:

(خاکی نیشتیمان نافرۆشرێت ئەو وڵآتەی کە بەخوێن دەسگیر بوبێت نافرۆشرێت مەگەر بەهەمان نرخ) .

ئینجا کە جولەکە بێ هیوا بوون لەسوڵتان (عبد الحمید) کەوتنە پیلان دانان بۆ ڕوخاندنی خەلافەتی عوسمانی .

ڕۆژ بەڕۆژ جوولەکە (دۆنمە) کان دەسەڵآتیان پەیدا دەکرد لەناو دەوڵەتدا (جاویدای داڤیت) کە ئەندامی (اتحاد والترقی) بوو، بوو بەوەزیری دارایی .

جوولەکە زۆربەی پیاوانی دەوری سوڵتانیان هەڵخەڵەتاند و بۆ مەرامی خۆیان بەکاریان هێنان وەك (انور پاشا) و (جەمال پاشا) کەئەم دوانە

ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە (انقلاب)ە کەدا، ئەم دووانە پاش ماوەیەك هاتنەوە هۆش خۆیان و هەستیان بەتاوانی خۆیان کرد بەرامبەر گەل و نیشتیمان و ئاینەکەیان، جارێك (انور پاشا) بە (جمال پاشا) دەڵێت: (جەمال دەزانیت تاوانمان چی یە ؟!)

پاش داخ و حەسرەتێکی زۆر ووتی: (ئێمە سوڵتان عبدالحمید مان نەناسی و بوینە ئالەتێك بەدەستی جوولەکەوە، ماسۆنیەتی جیهانی بەرکاری هێنایـن، ئێمە هەموو هەوڵێکمان بۆ جولەکەدا کەئەوەش تاوانی ڕاستەقینەمانە) .

پاشان کەوتنە پارچە پارچەکردنی دەوڵەتی عوسمانی، بۆنموونە (مەتر سالمی) جوولەکە کەلەپلەی (٣٣) ی ماسۆنیدا بوو چو بۆ ئیتالیا و چاوی کەوت بەسەرۆکی شارەوانی ڕۆما ئەویش لەهەمان پلەی ماسۆنیدا بوو نەخشەیەکیان دانا کەبەهۆیەوە دەوڵەتی عوسمانی سوپاکەی لەلیبیا بکێشێتەوە بەرەو یەمەن و ئیتالیاش فرسەت بهێنێت و لیبیا داگیر بکات ئەوەبوو لەساڵی ١٩١٢دا ئیتالیا لیبیای داگیرکرد [١١] .

لەپاش سوڵتان (عبد الحمید) چەند سوڵتانێکی لاوازیان هێنا تا بارودۆخەکە لەباربوو بۆیان ئینجا (کەمال ئەتاتورك) جمهوریەتی ڕاگەیاند و لەساڵی ١٩٢٤ خەلافەتی بەیەکجاری ڕوخاند . جوولەکە تورکیایان بەرەو تورکایەتی برد و کەوتنە چەوساندنەوەی کورد و عەرەبەکان بەرامبەر بەوەش کورد و عەرەب سەرقاڵی قەومایەتی کران و ئەو مەبەستانەی دوژمنانی ئیسلام هەیان بوو زۆربەی هاتە دی .

(کەمال ئەتاتورك) کەبن و بنچینەی نازانرێ هەندێ لەوباوەڕەدان کە زۆڵە، وەها زلیان کرد کەهەر لەسەردەمی ژیانی خۆیدا هەموو تورکیایان پڕکرد لەپەیکەری برۆنزی کەلەوڵاتە بیانیەکان بۆیان دروست دەکرد، جا

ئەگەر بەپارەی هەریەکێ لەوپەیکەرانە تراکتۆرێك بکڕدرایە، ئەوا تورکیا دەبوە گەورەترین دەوڵەتی گشتوکاڵی، یان ئەگەر بەپارەی هەر دە پەیکەر و قوتابخانەیەك دروست بکرایە، هەر لەپەنجاکانەوە نەخوێندەواری لەتورکیادا نە دەما .

(١٠)

**پرۆتۆکۆڵەکانی جوولەکە:**

لەساڵی ١٧٧٠ ی زاینی دا جوولەکە دەوڵەمەندەکان (کەلەپاشاندا دامەزراوەی روتشلدی جوولەکەیان دروست کرد) هانی (أدم وایزهاویت) یان دا کە مامۆستای لاهوت و زانای زانکۆی (انغولدشتات) بوو، وە بوو بوە جوولەکە، کە پرۆتۆکۆلە کۆنەکانی جوولەکە رێك بخاتەوە و بە شێوەیەکی تازە دایرێژێتەوە ئەویش بەوکارە هەستا و لەساڵی (١٧٧٦) ز دا تەواوی کرد . ئینجا کۆمەڵەی (نورانی یەکان) دامەزرا، کەپێك هاتبوو لەنزیکەی دوو هەزار جوولەکەی هەڵکەوتوو لەبواری وێژە و زانست و ئابووری و پیشەسازی ... هتد، هەر لەم کاتانەشدا (محفل الشرق الاکبر) دامەزرێنرا، پاشان داواکرا لەنووسەری ئەڵمانی (تسفاك) کەدەست نوسەکانی (ادم وایز هاویت) لەپەڕاوێکدا کۆبکاتەوە، ئەویش کۆی کردەوە و ناوی نا (المخطوطات الاصلیة الوحیدة) .

لەساڵی ١٧٨٤ دا نوسخەیەك لەونوسراوە نێردرا بۆ ئەو (نورانی یانەی) کە (ادم وایز هاویت) نارد بوونی بۆ فەرەنسا بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش تیایدا، لە رێگادا هەورە بروسکەیەك دای لەهەڵگری نووسراوەکە و کوشتی، نوسراوەکە کەوتە دەست پیاوانی میری (باڤاریا)، جا حکومەتی (باڤاریا) کەوتە لێکۆڵینەوەی نوسراوەکە و (محفل الشرق الاکبر) یان داگیر کرد و کەوتنە پشکنینی، بەمەش چەند بەڵگە نامەی دیکە یان بەردەست

کەوت، بۆیە حکومەتی (باڤاریا) مەحفەلەکەی داخست و لەساڵی ١٧٨٥دا کۆمەڵەی (نوورانی یەکان) لەیاسا دەرچو لەقەڵەم دا و پیلانە نهێنیەکانی ئاشکرا کردن و لەناو خەڵکدا ڕیسوای کردن .

لەساڵی ١٨٩٢ زدا (نوورانی یەکان) کۆنفراسێکیان لە (نیۆیۆرك) بەست، پاشان لەساڵی ١٨٣٤ دا شۆڕشگێری ئیتالی بەناوبانگ (مازینی) یان هەڵبژارد کەبە کاری بهێنن بۆ هێنانە دی پیلانەکانیان، پاشان جەنڕاڵی ئەمەریکی (البرت بایك) یان ڕاکێشایە ناوڕیزەکانی خۆیانەوە و ئەویش زۆر بەچالاکانە کەوتە پیلان دانان لەساڵی ١٨٥٩ ز تاوەکو ساڵی ١٨٧٠ز ئەویش بەوەی کە چەند جەنگێکی جیهانی هەڵگیرسێنن و لایەکی مرۆڤایەتی بەقڕبدەن بۆ مەرامی گلاویان .

زۆربەی پیلانەکانی (البرت بایك) جێبەجێکرا، ئەوە بو شەڕی جیهانی یەکەمیان هەڵگیرساند بەوهۆیەوە حوکمی قەیسەری روسیایان لەناوبرد و مۆڵگە و بنکەی ئەو شیوعیەتەی کەبەفەرمانی جوولەکە بنەماکانی داڕێژرابوو .

پاشان شەڕی جیهانی دووەمیشیان هەڵگیرساند و بەهۆیەوە ڕێیان بۆ خۆش بوو (کیان) ێك لەفەلەستیندا دامەزرێنن . کە ئاشکرایە بەملیۆنەها کەسی تیا کوژرا و جەرگی ملیۆنەها دایکی تێدا سووتا و ماڵی ملیۆنەها کەسی تیا کاول بوو .

بنکەی سەرکردایەتی جوولەکە تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لە شاری (فرانکفۆرت) ی ئەڵمانیا بوو، تا (اسرة روتشلد) دروست بوو، پاشان کەحکومەتی (باڤاریا) ئابڕووی بردن، بنکەیان گواستەوە بۆ (سویسرا) لەساڵی (١٧٨٦) زدا، پاشان لەکۆتایی شەڕی جیهانی دووەمدا بنکەی سەرکردایەتیان گواستەوە بۆ شاری (نیۆیۆرك) لەئەمەریکا .

سەرکردایەتی جوولەکە چالاکانە کاری دەکرد بۆ بەئەنجام گەیاندنی پیلانەکانیان بۆیە لەساڵی ١٨٩٧ ز هەتا ساڵی ١٩٦٠ ز بیست و پێنج کۆنفرانسیان بەست، کەیەکەمیان لەشاری (بازل) بوو لەسویسرا بە سەرۆکایەتی (هرتزل) لەساڵی ١٨٩٧دا، لەم کۆنفرانسەیاندا (٣٠٠) سەرکردەی جوولەکە کەنوێنەری پەنجا ڕێکخراوە بوون بەشداریان کرد و جەختیان کردە سەر بەدیهێنانی ئامانجەکانیان و دەست گرتن بەسەر جیهاندا ...

ئافرەتێکی فەرەنسی توانی هەندێ لەبەڵگەنامە نهێنی یەکانی ئەو کۆنفرانسە بدزێت لەسەرکردەیەکی جوولەکە، لەیەکێ لەبنکەکانی ماسۆنیەت لە فەرەنسا، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، نوسخەی ئەو بەڵگە نامانە لە (پاریس) ەوە گەیشتە (روسیا) پاشان کەوتە دەست ئەفسەری رووسی (سرجی نیلوس) کە ئەویش تا ساڵی (١٩٠٣) ز وەری گێڕایە سەرزمانی رووسی ولێکۆڵینەوەی لەسەرکرد، پاشان نوسخە ڕووسی یەکەی لەڕووسیا لەچاپ درا و هەر بەکەوتنە بازاڕیەوە، لەلایەن جوولەکەوە هەمووی کۆکرایەوە و سووتێنرا، (نوسخەیەك نەبێت کە گەیشتە (مۆزەخانەی بریطانی) ... لەوێش کەس نەبوو لای لێ بکاتەوە، تاوەکو شۆڕشی روسی بەرپابوو لەساڵی ١٩١٧ ز، لەوکاتەدا نوسخەکە وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی، جوولەکە کەدەستی تاوانی ئاشکرابوو بۆ جیهان، کەوتنە خۆیان و بەهەموو لایەکدا بلاْویان دەکردەوە کە ئەوان بێ بەرین لەو (پرۆتۆکۆلات) ە گوایا بەدەم ئەوانەوە هەڵبەستراوە ... بەلاْم ڕۆژگار سەلماندی کە ئەوانە هەمووی پیلانی ئەوانە، دژ بە مرۆڤایەتی یە و زۆریشی هاتنە دی . وەك هەڵگیرساندنی دووشەڕی جیهانی و

هەڵگیرساندنی شۆڕشی فەرەنسی و ڕووخاندنی قەیسەری ڕووسی و ڕووخاندنی خەلافەتی ئیسلامی ... هتد)[١٢].

## دوا وتە

بەکورتی و بەکوردی ئەوە لاپەڕەیەکە لەمێژووی ڕەشی جوولەکە، کە ئاوێنەیەکی بالآنمایە و ئەمڕۆ زۆر ڕاستی تێدا دەبینین، ئەوەش کە ئەمڕۆ جوولەکە داوای ئاشتی دەکات، پیلانێکە بۆ خەڵەتاندن و چەواشە کردن ... ئەگینا جوولەکە لەساڵی ١٨٩٧ ز دا کە بڕیاریان دا بە پەنجا ساڵ دەوڵەتی جوولەکە لەفەلەستین دابمەزرێنن لەساڵی ١٩٤٧ دا دایان مەزراند، وەلە هەمان ساڵ دا کەبڕیاریاندا بەسەد ساڵ دەوڵەتە گەورەکەیان دابمەزرێنن کە دەکاتە ١٩٩٧ ز .... تا ئێستا و لەمەودواش کاریان بەردەوامە وکاری بۆ دەکەن ...

جا ئەم ڕاستی یانە بڕوادار بێ هیوا ناکات چونکە کۆبوونەوەی جوولەکە لە شوێنێکدا و خراپە نانەوەیان لەسەرتاسەری جیهاندا بەرەو لەناوچوونیان دەبات کەخۆشیان ئەمە باش دەزانن، مامۆستا (راشد) لە محاضرە یەکی دا دەڵێت: (پیرێژنێکی جوولەکەی دراوسێمان هەبوو لەساڵی ١٩٤٨ دا لەبەغدا، کە جوولەکە دەوڵەتەکەیان دامەزراند هەموو جوولەکەکان دڵخۆش بوون، کەچی ئەو دەهاتە ماڵی ئێمە و دەگریا و لێمان دەپرسی بۆچی ؟ دەیووت: (ئێمە لەپەڕاوەکانماندا باس کراوە، کاتێ کە کۆبووینەوە لەفەلەستین لەناودەبرێین ؟!) .

خوای پەروەردگاریش لەسورەتی (الاسراء) دا باسی زیادە ڕەوی خراپەکاری جوولەکە دەکات، کاتێ کە دەگەنە ئەو پەڕی، پەروەردگار

لەناویان دەبات هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾ ﴾

الإسراء: ٤ – ٨ واتە: (لەتەوراتدا بەبەنی ئیسرائیلمان ڕاگەیاندوە کە ئێوە دووجار لەزەوی‌دا فەساد و خراپە دەنێنەوە و دەگەنە دوا پلەی سەرکەشی و خۆ بەزل زانین، جا کاتێ وادەی تۆڵەسەندنمان هات لەیەکەم جاری خراپەتان، ئەوا کۆمەڵێ لەبەندەی خۆمتان بۆ دەنێرین کە وەکو ئاگری ڕۆژی ڕەشەبا هەموو کون و قوژبنێك بسوتێنن و تەفر و توناتان بکەن . ئەم تۆڵە سەندنەش فەرمانی پەروەردگاری لەسەر دەرچوو بوو بۆیە هەر دەبوایە بێتە دی . ئینجا جارێکی دی مۆڵەتمان دانەوە و نەوە و ماڵ و دارایی زۆرمان پێ‌دان سا بەڵکو چاکە بکەن بۆخۆتانە و خراپەش بکەن سزاکەی وەردەگرن . جا کاتێ وادەی تۆڵە سەندنی خراپەکاری دووەمتان هات ئەوا بەهەمان شێوەی جاری یەکەم سوپایەکتان بۆ دەنێرین کە ڕووتان ڕەش بکەن و پەرستگا و تەخت و تاراجتان تێك بدەن . ئەگەر چاك نە بن و نەگەڕێنەوە سەر خراپەکاری ڕەنگە خوا ڕەحمتان پێ‌بکات، وەئەگەر نا کە گەڕانەوە سەر خراپە ئێمەش دووبارە دەگەڕێینەوە سەر سزا ناردن و دۆزەخیش سزای قیامەتیانە ناتوانن لێی دەرباز ببن) . زانایان دەڵێن کە

جاری یەکەم (بختصری بابلی) لەناو بردن و جاری دووەم هێشتا ماوە، هەرچەندە زۆر جاری دیکە خراپەیان ناوەتەوە بەلاّم ﴿ ولتعلن علواً كبيراً ﴾ ی لەگەڵ نەبووە، بۆیە لەوەدەچیّ خراپەی ئەم سەردەمەیان ئەو (علو) ەی لەگەڵ بێت و پەروەردگار بەدەست موسڵمانان لەناویان بەرێت . جاری دووەم جیاوازە لەناوبردنی نزیك قیامەت کە لە فەرموودەدا باس دەکرێت، چونکە لەنزیك قیامەتتدا (قودس) بەدەست موسڵمانانەوە دەبێت و جوولەکەش لەگەڵ (دجال) دا دێنە سەرموسڵمانان و ئەو جەنگە ڕوودەدات کە بۆ جارێکی دیکە جوولەکەی تیا بەقڕدەچێت [١٢]. بەڵێ بەفەزڵی خوا موسوڵمانان دەگەڕێنەوە بۆ ئیسلامەتی و ڕابوونی ئیسلامی سەرتاسەری جیهانی گرتۆتەوە، کە ئاشکراشە سەرەنجام بۆ چاکە کارانە و بەپێی ئەو مژدانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی داوین جارێکی دی لە ژێر سایەی حوکمی ئیسلامیدا مرۆڤایەتی بەختەوەر دەبێتەوە ... کە ئەمەش بۆ خوا زۆر ئاسانە ...

**بەهیوای دوعای خێرتان تا بەیەك گەیشتنەوەیەکیتر، ئەگەر عومر باقی بێ بەخواتان دەسپێرم، هەرشاد و سەرفرازبن.**

# ناوەرۆك

إن الإسلام الذي يريده الأمريكان وحلفاؤهم في الشرق الأوسط، ليس هو الإسلام الذي يقاوم الاستعمار، وليس هو الإسلام الذي يقاوم الطغيان، ولكنه الإسلام الذي يقاوم الشيوعية، إنهم لا يريدون للإسلام أن يحكم.

إنهم يريدون إسلامًا أمريكانيًا، إنهم يريدون الإسلام الذي يُستفتى في نواقض الوضوء، ولكنه لا يُستفتى في أوضاع المسلمين السياسية والاقتصادية والاجتماعية والمالية، إنها لمهزلة بل إنها لمأساة.

سيد قطب

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٦١٠ ) ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە

